یەکەمین گۆڤاری کارگێری و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا
27
لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا
بڕیار
منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada,com
مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێری و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی سێیەم -تابی ٢٠١٠
ئەندازەسازی ژیان!
ڕەمەزان پشوویەك بۆ ڕۆح
لێکۆڵینەوەی زانستی
ئێستا نە زووە، نە درەنگە!
کێ سەرکردایەتیت دەکات؟
با منداڵەکانمان خۆیان بەدوای
وەڵامی پرسیارەکاندا بگەڕێن !!

پیرۆز بێت مانگی پڕ فەڕو
بەرەکەت و میهرو بەخشینی خودایی

با ڕەمەزان بکەینە
مانگی برایەتی و میهرو خۆشەویستی و
بەزەیی و یارمەتیدانی هەژاران و بێەوایان

The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

مانگانەیەكی تایبەتە بە كارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی سێیەم – ژمارە 27 – ئاب 2010

بەڕێوەبەری نووسین

**بەرزان ئەبوبەكر**

سكرتێری نووسین

**ئەسكەندەر ڕەحیم**

ب: پەیوەندییەكان

**محەمەد هاشم محەمەد**

دەستەی نووسەران

**هاژە شێروانی** — **پەیمان بەرزنجی**

**بیگەرد فارس** — **پەری شێخ كەریم**

**وەهاب حەسیب** — **محەمەد مێرگەیی**

ڕاوێژكاری یاسایی

**پارێزەر: ئازاد محیّدین**

دیزاین

**جەمال دەروێش**

**پشتیوان عەبدولڕەحمان**

بەشی ڕیكلام

07480112787

حساب بانكی گۆڤار

بانكی كوردستانی نێودەوڵەتی سلێمانی 3371

خاوەنی ئیمتیاز

**ئەندازیار مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی**

سەرنووسەر

**عادل محەمەد شێخانی**

sarnosar@yahoo.com


بۆ دابەشكردنی بڕیار

هەولێر: خانەی سیروان ٠٧٥٠٤٦٧٢٩٦٣

كەركوك: ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ هەڵەبجە: ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ -٠٧٥٠١١٢٩٤٢٧

دەربەندیخان: ٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ كفری: ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ كەلار: ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨

چەمچەماڵ: ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ كۆیە: ٠٧٧٠١٥٤٩٧١٤ سۆران: ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣

چۆمان: ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ قەڵادزێ: ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١ ڕانیە: ٠٧٧٠١٥٨٠٤٤٢

ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم

بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە

٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢ ٣١٩٣٩٤٦

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

چاپخانەی سەردەم

نرخ 2500 دینار

## خودایە

دڵێك مەسوووتێنە، کە نووری تۆی تێدایە

چاوێك ئازار مەدە ... بۆ گەورەیی تۆ دەڕوانێت

پێیەك مەشکێنە ... لە پێناوی ڕازیبوونی تۆدا

هەنگاو دەنێت!

ئەو پەنجانە بپارێزە بۆ تۆ دەنووسن

ئەو دەستانە بڵندکە لەبەر خۆشەویستی تۆ دەبەخشن

خودایە... لە مرۆڤە هەست گەرمو دڵنەرمو

فریشتەئاساکان ببورە..

ئەوانەش تا ئێستا مەحرومن لە سۆزی ڕەحمی تۆ

بێ کەسو بێ پەناو بێ چڕان

خودایە

لەو دەریای پڕ میهرەت... دڵۆپێك

ببەخشە بە دڵی کەساسیان...

بۆ گوڵو گوڵزاری ڕازاوەت

بیانکە باخەوان!!

ڕۆژانە چۆن هەنگاو دەنێیت؟

چۆن بۆ ژیانو بوونەوەر دەڕوانیت؟

ئارەزووەکانت چین؟ هەستو نەستت گوزارش لە چی دەکات، خۆشەویستیو ڕقت بەرەو کوێ ئاراستە دەکەیت؟

هەموو ئەمانە جڵەویان بە دەست ئەو سەرکردەیەیە کە لە ناخی تۆدا دەژی؟!

ئایا تا ئێستا ئەو پرسیارەت لە خۆت کردووە؟ ئەو سەرکردەیە کێیە؟ کە هەمیشە هاودەممەو لە خەیاڵمدا دەژیو تەنانەت لە خەویشدا دەستبەردارم نابێت؟

تا ئێستا هەستت بەو هێزە نەکردووە کە ڕۆژانە ئاراستەت دەکاتو ڕێنماییت دەکات، تۆش هەموو ئێوارەیەك بەرهەمی ئەو کارانە دەچنیتەوە کە ئەو فەرمانی پێکردوویتو تۆش ئەنجامت داوە، جا یا خۆشحاڵیت بەو کارانەی ئەنجامت داونو شانازییان پێوە دەکەیت!

یاخود پەنجەی پەشیمانی دەگەزیو بوونەتە مایەی شەرمەزاریت!

بە ڕاشکاوی پێت دەڵێم: هەموو ئەو کارانە لە ژێر سەری ئەو سەرکردەیەدایە کە لە ناخی تۆدا دەژی، کە بریتییە لە بۆچوونەکانت کە بەرهەمی بیرکردنەوەکانی تۆن.

کەواتە بیرۆکەکانت سەرکردایەتی تۆ دەکەن، تۆ ئەو فەرمانانە جێبەجێ دەکەیت کە هەڵێنجاوی ڕۆشنبیریو ڕاوبۆچوونو قەناعەتەکانی خۆتن.

کەواتە وریای ئەو بیرۆکانە بە کە لە مێشکتدا جێگیر دەبن، چونکە دواتر دەبن بە قەناعەتو کاریان لەسەر دەکەیت.

هەوڵ بدە خاوەنی عەقڵێك بیت کە خاوەنی بیرکردنەوەیەکی بێسنوورە، ئەویش بەوەی کە عەقڵێکی کراوەت هەبێت، چونکە عەقڵ وەکو پاراشووت وایە، وەختێك کاری خۆی ئەنجام دەدات کە بیکەیتەوە.

عەقڵی کراوەش بیروڕای بەرزو خەونی بێسنوورت پێ دەبەخشێت.

کەواتە تۆش وەکو (مایکل تولان) دەڵێت: (بیر لەو خەونانە مەکەرەوە کە لەگەڵ تواناکانتدا دەگونجێن، بە پێچەوانەوە بیر لەو توانایانە بکەرەوە کە لەگەڵ خەونەکانتدا دەگونجێن).

کەواتە هەوڵ بدە، ئەو سەرکردەیە بەهێز بکەیت کە لە ناختدا دەژیو ئاراستەت دەکات، هێزو دەسەڵاتی ئەویش، ڕۆشنبیریو ماریفەتو بیری جوانو بیرکردنەوەی لە بارو خۆشەویستی هەقو ڕاستیو ڕێزگرتن لە خودو بەرنامەڕێژیو دانانی ئامانجو دیاریکردنی پەیامی ڕوونە لە ژیاندا.

دوژمنە سەرسەختەکانی ئەو سەرکردەیەش دەمارگیریو زانیاری هەڵەو کۆنەپەرستیو بیرکردنەوەی نارێكو ئارەزووپەرستیو ڕێزنەگرتن لە خودو بەرامبەرەو نەبوونی ئامانجو بێبەرنامەییو نەبوونی پەیامێکی پیرۆز لە ژیاندا، گەندەڵترین سەرکردە لە ناخی تۆدا دروست دەکات.

هەڵبژاردنی ئەم سەرکردەیەش بۆ هەر یەکێك لە ئێمە لە هەڵبژاردنی سەرکردەی وڵاتیش گرنگترە، چونکە سەرکردایەتی تایبەتو ڕاستەوخۆی ئێمەی پێسپێردراوە.

هاوکات خۆت سەرپشکی لە هەڵبژاردنیداو ڕێگا مەدە هیچ کەس لە بری تۆ بڕیار بداتو لە دیاریکردنیدا هیچ دەستێوەردانێکی هەبێت.

دەشتوانیت بۆ هەمیشە ئەو سەرکردەیە بەهێزو گوڕی لاوێتییەوە بهێڵێتەوە ئەگەر بەردەوام خەیاڵی نوێو بیری نوێو ئامانجی نوێت پێببەخشی.

ئەو کاتەش هیچ شتێك لە بەرامبەر ئەو هێزەدا مەحاڵ نابێت، چونکە مرۆڤە زیرەكو ئازاکان تەنها ئەو شتانە نابینن کە گونجاوەو ئەگەری بوونو ڕوودانی هەیە، بەڵکو مەحاڵەکانیش دەبینن و دەزانن چۆن دەیانگۆڕن بۆ ئاساییو گونجاو، وەکو (شیری کارتەر) دەڵێت.

ئیتر با بەوپەڕی متمانە بە خۆبوونەوە بەرەو لوتکەی ئامانجەکانمان هەنگاو بنێین، بێگومان مرۆڤێکی خاوەن ئامانج کە باوەڕی بە خۆیەتی لە سەدان کەس بەهێزترە کە بێ هیچ ئامانجێك ملی ڕێگایان ناوەو نازانن بەرەو کوێ دەچنو کێ سەرکردایەتیان دەکات!

# کارگێڕی بە گوفتار

کۆمەڵگا وەکو کەشتییەک وایە، لەسەر هەموو سەرنشینەکانی پێویستە ئامادەی وەرگرتنی سەرکردایەتی بن.

**هینری سیب**

هەر نەریتێک ئەگەر بەرەنگاری نەبیتەوە، دەبێتە پێداویستی.

**ئۆجیستین**

جوانترین خەندە، ئەو خەندەیەیە کە لە نێو فرمێسکدا ڕێگای خۆی دەکاتەوە.

**پەندیکی ژاپۆنی**

ئەگەر نەتتوانی شارێک دروست بکەیت، دڵێک دروست بکە.

**پەندیکی کوردی**

داماوترین گەل ئەو گەلەیە، چاوەڕوانی پاڵەوانێک دەکات.

**بیرتۆڵت بیرشت**

توانجگرتن لە کەڵەپیاوان، سەرەخۆشی مرۆڤە بێکەڵکەکانە.

**ئیزاک**

# کارگێڕی بە چیرۆك

# بەختەوەری و دوو دڵۆپ زەیت!

دەگێڕنەوە بازرگانێك کوڕەکەی خۆی ناردە لای حەکیمێك، تا نهێنی بەختەوەری فێربێت!

کوڕە لاوەکە چل ڕۆژ بە ڕێدا ڕۆیشت تا گەیشتە کۆشکێکی جوان لەسەر لوتکەی چیایەکی بەرز.

کاتێك گەیشتە کۆشکی حەکیم، بینی ئەوا خەڵکێکی زۆر لە دەوری حەکیم کۆبوونەتەوەو هەر جارەی یەکێکیان دەدوێنێ، لەبەرئەوە ناچار بوو، دوو کاتژمێر چاوەڕوانیی بکات، تا نۆرەی دێت.

دواتر حەکیم زۆر بە جوانی گوێی بۆ لاوەکە شلکردو پاشان پێی گوت: ئێستا کات مەودا نادات، نهێنی بەختەوەریو سەرفرزایت بۆ باس بکەم، بەڵام ئێستا بچۆ بە نێو کۆشکەکەدا تۆزێك بگەڕێو ئەم کەوچکە بچکۆلەیەش کە دوو دڵۆپ زەیتی تێدایە هەڵگرە، با بەدرێژایی گەشتەکەت بە دەستەوە بێت، وریابە نەیەڵیت دڵۆپە زەیتەکان بڕژێت.

لاوەکە بە پلیکانەی کۆشکەکەدا سەردەکەوتو دەهاتە خوارێ، بەڵام چاوی هەر لای کەوچکەکە بوو، پاشان گەڕایەوە لای حەکیم.

ئەویش لێی پرسی: چاوت بە مافورە کاشانییەکەی ئاشبەزخانەکە کەوت؟ باخچە بچکۆلانەکەت بینی؟ کتێبە جوانەکانی نێو کتێبخانەکە سەرنجی ڕاکێشایت؟

لاوەکە پەشۆکاو دانی بەوەدانا، کە هیچی نەبینیوەو تەنها خەیاڵی لای دوو دڵۆپە زەیتەکەی نێو کەوچکەکە بووە تا نەڕژێت.

حەکیم پێی گوت: بگەڕێوەو شارەزای نێو کۆشکەکە ببە، چونکە ناتوانیت متمانە بە کەسێك بکەیت کە شارەزای ئەو خانووە نییە کە تیایدا دەژی.

لاوەکە گەڕایەوە نێو کۆشکەکەو ئەمجارە تەماشای شاکارەکانی نێو کۆشکەکەی دەکردو لە تابلۆ جوانەکانو گوڵزارو باخچەکان ڕادەما.

کاتێکیش گەڕایەوە لای حەکیم، بە درێژی هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە.

بەڵام حەکیم لێی پرسی: ئەی کوا دوودڵۆپە زەیتەکەی نێو کەوچکەکە، کە بڕیاربوو پارێزگاری لێ بکەیت؟

لاوەکە تەماشای کەوچکەکەی دەستی کردو بینی زەیتەکە ڕژاوە!

لە وێدا حەکیم گوتی: ئەمە ئەو ئامۆژگارییەیە کە دەمەوێت پێشکەشتی بکەم، (نهێنی بەختەوەری ئەوەیە کە شاکارەکانی دونیا ببینی بێ ئەوەی بهێڵیت، هەرگیز دوو دڵۆپە زەیتەکە بڕژێت).

*لەم چیرۆکەوە فێردەبین:*

١-دەوڵەمەندو بازرگانەکان زیاتر لە هەموو کەسانی دی عەودالی نهێنی بەختەوەرین، چونکە وا دەزانن پارەو سامان درك بە هەموو نهێنییەك دەباتو هەموو شتێك دەستەبەر دەکات.

٢-نهێنی بەختەوەری لە ناخی خۆماندا دەژی، بەڵام ئێمە لە دەرەوەی ناخی خۆماندا هەموو کونجو کەلەبەرێکی بۆ دەگەڕێین.

٣-هاوسەنگی لە نێوان خۆشییەکانو دونیاو بەها بەرزەکاندا وەکو هاوسەنگی نێوان تەمەشاکردنی جوانی کۆشکەکەو پارێزگاریکردن لە دوو دڵۆپە زەیتەکە وایە.

٤-گرنگە بتوانیت چێژ لە خۆشییەکانی دونیا وەربگریتو هاوکات بەهاکانی خۆشت لە دەست نەدەیت. بۆ خۆشییەکی کاتی خودی خۆتو داهاتووت لە دەست نەدەیت.

٥-وریابە خەریکبوون بە شتە جوانەکانەوە وەهات لێ نەکات دڵۆپە زەیتەکان بڕێژیو بە دەستی خاڵییەوە جارێکی تر وێڵی بەختەوەری ببیت.

# چارەسەرکردنی نەریتە خراپەکانی فەرمانبەر

هاژە شێروانی

هەروەك لە ژمارە (٢٦)دا ئاماژەمان کرد بەو نەریتانەی کە دەبنە مایەی بێزاری لە فەرمانبەردا، لەم ژمارەیەشدا هەوڵ دەدەین لەگەڵ تۆی خوێنەری بەڕێز بە گوێرەی تواناو لێهاتوویی‌و کارامەیی خۆت هەوڵ بدەین بە یەکەوە بۆ جێبەجێکردنیان بە پێی بارودۆخی ناو ژوورەکەت، نووسینگەکەت، دامەزراوەکەت، کۆمەڵگاکەت، بۆ ئەوەی ببین بە کەسێکی بەرهەمهێنەرو کەسێك بین بتوانین سوودێك بە خۆمان‌و دەوروبەرو ژینگەو کۆمەڵگاکەمان بگەیەنین، نەوەکو تەنها فەرمانبەری بە سەربردنی کات بین‌و سەری مانگیش یەکەم کەس بین بۆ وەرگرتنی مووچەکەمان، هەڵبەت دەبێت بیر لەوەش بکەینەوە کە ئایا شایانی ئەوەین کە ئەم مووچەیە وەربگرین؟ یان نا؟! هەروەك روونیشە ئەمەشیان پێویستی بە هەڵسەنگاندنی خود هەیە کە دەبێت ماوە ماوە بە خۆماندا بچینەوە کە لەوانەیە بە کاریگەری‌و کارتێکەری رۆژانە کە رووبەرووی ناخۆشی‌و تەنگو چەڵەمەو دەردەسەرییەکان دەبینەوە، وامان لێدەکات کە لە سروشتی کەسایەتی خۆمان دەربچین‌و هەندێك هەڵسوکەوت‌و رەفتاری نەشیاو بکەین کە لەوانەیە لە بێ ئاگایی خۆمانەوە بێت، یان درك نەکردنمان بێت پێی، لەم خاڵانەی خوارەوەشدا لەگەڵمان بن بۆ ئەوەی پلانێك بۆ بنەبڕکردنی ئەو نەریتە خراپانە دابنێین:

١- هەرگیز هەوڵ مەدە کە خۆت هەڵبقورتێنیت لە کاروباری تایبەتی‌و بچیتە ناو وردو درشتی ژیانی تایبەتی هاوکارێکت، هاونووسینگەیەکت، ئەگەر هاتوو هەستیشت کرد هاوکارێکت خەمێك، یان گرفتێك، یان شڵەژاوییەکی تیا بەدی دەکرێت، ئەوا دەبێت بە شێوەیەك بیدوێنین کە ئەگەر پێویستی بە یارمەتی بەرامبەر بێت ئەوا خۆی لەم هەڵوێستەی تۆ نزیك دەبێتەوەو متمانەی لە لا دروست دەبێت بە تۆو هەموو شتێکت بۆ دەدرکێنێت، ئەگەر نا ئەوا زۆر پێداگری بۆ زانینی نهێنییە تایبەتییەکان لەوانەیە تووشی فشارت بکاتو لە دواییدا گرفتار بیتو سیمای جوانی خۆت بشێوێنیت، وەکو دەڵێن: (ئەوەی چاودێری خەڵك بکات، لە خەفەتان دەمرێت)، کەواتە با بە جوانترین شێوە سەرقاڵی کاروباری ناو نووسینگەو بەڕێوەبردن‌و راییکردنی مامەڵەکان بین نەوەك شتی بێ سوود.

٢- لەوانەیە تۆی فەرمانبەر لە هۆبەیەك بیتو ئەوەندە کارت بە سەرەوە نەبێت، لە هەمان دامەزراوەی تۆ یەکەو هۆبەی وا هەیە کە نقومی کار بوون‌و دەرفەتی نانخواردنێکی بە ئیسراحەتیان نییە، هەرگیز هەوڵمەدە کە بە سەردانە بێ کارەکانت سەرقاڵیان بکەیتو لە بری ئەوە دەتوانیت دوای کۆتایی هێنان بە کارەکانی خۆت سەردانیان بکەیتو ئەگەر بینیت سەرقاڵن، پێیان بڵێ بزانە دەتوانیت کە یارمەتیان پێشکەش بکەیت، خۆ ئەگەر بیانەوێت ئەوا فەرمووت لێدەکەن‌و گەر واش دەرنەچوو، سوپاسیان کردیتو پێیان راگەیاندیت کە تەنها بە خۆیان دەکرێت، مانای وایە مامەڵەکەیان نهێنییەو نابێت کەسی تر بیبینێت، ئەوا یەکسەر هۆبەکەیان جێبهێڵەو بگەڕێرەوە جێگەکەی خۆت.

٣- هەوڵ بدە کەمترین رێژەی مۆڵەت وەربگریتو رەسیدەکەت دەوڵەمەند بکەیت بۆ کاتێك کە لەوانەیە زۆر پێویستت پێی هەبێت.

٤- دوورکەوتنەوە لە زۆر گاڵتەو گەپکردن‌و قسە هێنان‌و بردن‌و دروستکردنی ناوو ناتۆرەو کۆمەڵێك نەریتی تری خراپ، کە لەوانەیە لە نێو هاوکارەکانتدا هەبێت کە حەز بەم جۆرە هەڵسوکەوتانە نەکات، یان لەوانەیە کە دووره پەرێز بێتو حەز بە تێکەڵاوی نەکات، هەرگیز لێرەدا هەوڵ مەدە کە زۆری لێبکەیت بۆ راکێشانی بۆ نێو ئەم جۆرە باسانە، بەڵکو لە بری ئەوە هەوڵ بدە ئەو ئالییەتە بدۆزیتەوە کە چۆن ژینگەی کارەکەت دەکەیت بە شوێنێکی بەرهەمهێنەرو لەهەمان کاتیشدا چالاك‌و گەرموگوڕ لە بەڕێکردنی مامەڵەی سەردانکاران.

٥- ئەوپەڕی توانات بخەرەگەڕ کە چاودێرییەکی خودی خۆت بکەیت، (وەکو تاکی یابانی)، نەوەکو تەنها لە کاتی سوڕانەوەی بەڕێوەبەری گشتی بچیتە سەر نووسینگەکەت‌و کاتی تریش لێی تۆرابیت‌و بە لایدا نەچیت، ئەمەشیان کەڵەکەبوونی کارەکانت لەسەر کەمدەکاتەوەو دەبێتە

کەسێکی بەرهەمهێنەرو فشاری دەروونیت کەمدەبێتەوەو دڵنیادەبیتو شارەزای هەموو ئامێرو کەلوپەلەکانی نووسینگەکەت دەبیت، شتت لێ ون نابێتو دەروون ئارامیت لە کاتی ونبوونی هەر شتێکی نووسینگەکەت، یان ونبوونی مامەڵەیەکی گرنگ، بێگومان ئەوەشیان بە ڕێکخستنو ڕێککردنی کارەکانت دەبێت.

٦- خۆ نزیککردنەوە لە بەڕێوەبەر، یان بەرپرسی یەکەم، با بە تەنها بۆ دروستکردنی متمانە بێت لە سەر بنەمای ڕاستگۆییو دەستپاکیو ڕوونکردنەوە پێویستەکان لە کاتی لە یەك حاڵی نەبوون، بە پێچەوانەی ئەمەوە زۆر کەس زیان لێکەوتوو دەبن کە لەوانەیە تۆ یەکەمینیان بیت!

٧- لە کۆتایشدا هەوڵدان بۆ پتەوکردنی پەیوەندی نێوان هاوکارەکانی کارەکەت، هەوڵدە یەکەم کەس بیت کە چوویت بۆ سەر کارەکەت سڵاو بکەو لە ئەحواڵی نادیارەکانیان بپرسەو بە دوای ئەوانەشدا بڕۆ کە نەخۆشن، یان گرفتێکیان هەیە، هەوڵیش بدە کە لە کاتی کێشەو ناخۆشییەکانو خۆشییەکاندا هاوکاریو هاوبەشی بکەیت بۆ نموونە دەبینیت هاوکارێکتان یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەی نەخۆشەو پارەی نەشتەرگەری نییە، ئەوا بە کۆکردنەوەی بڕە پارەیەکی کەمیش بێت خۆشییەك دەخەیتە نێو دڵەکان ئارامییەکیان پێ دەبەخشیتو دڵنیاش بە کە چی بچێنیت هەر ئەوە دروێنە دەکەیت.

٨- هەوڵدان بۆ ڕێکخستنی پرۆگرامی خۆش لەگەڵ هاوکارانی دامەزراوەکەت، وەکو ڕێکخستنی گەشتی خێزانی لە ڕۆژێکی پشووداو سەردانی شوێنە گەشتو گوزارییەکان، هەر هیچ نەبێت ساڵانە جارێك ئەمە ڕێکبخرێت ئەمەشیان بۆ زۆرتر ناساندنو کەمکردنەوەی فشاری کارەکەمان بێت، هەروەك دەتوانرێت مانگانە جارێك هەوڵبدرێت لەگەڵ هاوکارەکانتان خواردن دروست بکەنو سەردانی پارکو شوێنە گەشتیارییەکانی ناوەوەی شار بکەیت، یان هەر هیچ نەبێت ژەمە خواردنێك لە دەرەوەی دامەزراو بە یەکەوە بخۆن، دڵنیام ئەمانەو زۆرێك لە شێوازی تر دەتوانین کە پەیڕەویان بکەین بۆ کەمکردنەوەی فشاری کارو بە سەربردنی کاتێکی خۆش، بە هیوای جوانترکردنی سیمای ژینگەی کارەکانمانو دوورکەوتنەوە لە نەریتە خراپەکان.

# سزادان و خەڵاتکردن

ئا: ئیحسان شەریف صالح

ڕۆژێك پاشایەك، وەزیرێکی بۆ خۆی هەڵبژاردو پێی گوت: (وا باشترە کارەکان لە نێوان خۆماندا دابەش بکەین، تۆ سزادانی کەسەکان لە ئەستۆ بگرەو منیش هاندانیانو پاداشتکردنیان). وەزیریش گوتی: (زۆرباشە من سزاکان جێبەجێ دەکەم، تۆش هاندان).

دوای ماوەیەك لەم دابەشکردنە پاشا بۆی دەرکەوت کە کاتێك فەرمان دەکات زۆربەی خەڵك گوێی لێ ناگرنو دەستورەکانی جێبەجێ ناکەن، بەڵام کاتێك وەزیر قسەیەك دەکات هەموویان بەوپەڕی پەرۆشییەوەو زۆر بە خێرایی دەستورەکانی جێبەجێ دەکەن. لەبەرئەوە بانگی وەزیری کردو پێی گوت: (وا باشتر نییە کە دووبارە کارەکانمان دابەش بکەینەوە؟ ماوەیەکە تۆ سزادانی خەڵکت لە ئەستۆ گرتووە، ئێستا با من ئەنجامی بدەم).

پاشان کارەکانیان گۆڕییەوە، لە ماوەی یەك مانگدا وەزیر بوو بە پاشا. لەبەرئەوەی کە پاشا کەسێکی میهرەبان بوو، خەڵاتی بە هەموو کەس دەدا، خەڵك وتیان: (ئەو پیرەمێردە چی بەسەر هاتووە؟)، لە ئەنجامدا پاشایان لە سەر کار لابرد، لە کاتێکدا کە دەیانویست کەسێك لە جێی دابنێن وتیان: ((دەزانن باشترین کەس بۆ پاشایەتی کردن کێیە؟ هەموو وتیان: بێگومان جەنابی وەزیرە!)) بۆیە وەزیریان بۆ پاشایەتی هەڵبژارد.

لەم چیرۆکەدا دەتوانین پاشاکە وەك بەڕێوەبەرێك دابنێین کە لە سەرەتادا هەڵدەستێ بە هاندانو خەڵاتکردنی کەسەکان لە دوواییدا سزادانیان، لەم چیرۆکە دا بۆمان دەردەکەوێت:

ئەگەر وەك وەزیر سەرەتا هەڵسی بە سزادانی خەڵكو پاشان پاداشتیان بکەیت، کارەکان بە دروستی بەڕێوە دەچێتو بەڕێوەبەرەکەش لە لایەن ئەو خەڵکەی کە لە ژێر دەستیدان بە کەسێکی زیرەك، سەرکەوتوو، زاناو خۆشەویست دادەنرێت.

ئەگەر وەك پاشا، بەڕێوەبەر سەرەتا هەڵسێت بە خەڵاتکردنی خەڵكو دوایی دەست بکات بە سزادانو سەرزەنشتکردنی کەسەکان، ئەوا لە لایەن خەڵکەوە بە کەسێکی نەزان دادەنرێتو بڕوایان پێ نامێنێت.

ئەگەر بێتو کەسێك پاداشت بکرێتو دوایی سەرکۆنەو سزا بدرێت، ئەوا کەسەکە وا تێ دەگات کە بەڕێوەبەر گۆڕاوە، یان کینەیەکی لە بەرامبەر پەیدا بووە، کارەکان بە دروستی بەڕێوە ناچن، هەربۆیە فەرمانبەرو بەڕێوەبەر سەرکەوتوو نابنو شکست دەهێنین.

# بیرکردنەوە و بڕیاردان

باپیر ساڵەح

هەمومان ئەم ڕاستیە دەزانین کە بۆ تێگەیشتنو ڕاڤەکردنی هەر شتێك کە لە ژیاندا بوونی هەیە لە لایەنی مادیو مەعنەوییەوە، یاخود بینراو بیستراو، پێویستمان بە بیرکردنەوەو تێڕامانێکی تایبەت هەیە بۆیان، جا هەر شتێك بە پێی ئاڵۆزیو سادەیی خۆی. لەم بارەیەشەوە خوای بەخشندە لە قورئانی پیرۆزدا بە چەندین شێوازی جۆراوجۆر پێمان دەفەرموێت: کە زۆر بیر بکەینەوە، بۆئەوەی لە حەقیقەتی گەردونو ژیان تێ بگەین.

هەندێجار بیرکردنەوەو بڕیارێکی ئێمە وادەکات کە کەشتی ژیانمان بە ئاڕاستەیەك دەڕواتو ئایندەیەکمان بۆ دیاری دەکات، کە بە هیچ شێوەیەك پێشبینیمان نەکردووە، جائەم داهاتووە خوازراومان بێت، یان نەخوازراو. زانایانیش لەسەر ئەوە کۆکن کە هەر سەرکەوتنێك بەدەست دێت بەرهەمی بیرکردنەوەو بڕیارێکی تەندروستە. ڕاستە هەموو مرۆڤێك بیر دەکاتەوە، وەلێ ئاستو شێوازی بیرکردنەوە جیاوازە لە مرۆڤێك بۆ مرۆڤێکی ترو لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی تر، هەروەها لە وڵاتێك بۆ وڵاتێکی ترو...هتد. ئەوەی من بە پێویستی دەزانم کە لێرەدا زیاتر تیشکی بخەمە سەر ئەوەیە کە دەڵێم بە داخەوە ئاستی بیرکردنەوە لە ناو تاکی کۆمەڵگەی کوردیدا زۆر لاوازە، چونکە بە بڕوای ئەز ئەوەندەی کە کۆمەڵگەیەکی لاسایی (تەقلید)مان هەیە نیو هێندە جڤاکێکی خاوەن فیکرو داهێنانو بڕیاری تایبەت بە خۆمان نییە، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

زۆربەی زۆری تاکەکان تەقلید دەکەن بەبێ تێڕامانو بیرکردنەوە لەم کردارەی ئەنجامی دەدەن! لە کاتێکدا زۆرێك لە تەقلیدەکانمان کاریگەری نەرێنیان گەلێك زیاترە لە کاریگەری ئەرێنی بۆ کۆمەڵگەکەمان! مەزنترین کێشەی کۆمەڵگەی ئێمە ئەوەیە کە زۆر کەم بیردەکەینەوەو لەگەڵ دەروونماندا دەدوێین، بۆیە عەقڵیەتمان ئاوا لاوازو سادەیەو بە سادەترین شت کاریگەر دەبینو بڕیاری عاتیفی دەدەین. بەبێ ئەوەی بگەڕێین بە دوای حەقیقەتدا!

زۆر کات هەیە ڕازی دەبین، یاخود بڕیارێك دەدەین بەرامبەر بەو شتەی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە بە بێ بیرکردنەوەو تیڕامانێکی قوڵ لێی، کاتێکیش بەرهەمەکەی ئەنجامێکی نەویستراو، یاخود خراپ دەبێت، دەڵێین خۆزگە زیاتر بیرم لێ کردبایەوە جا ئەم بڕیارەم دابا، یان گەلێك جار هەبووە هەر یەکێك لە ئێمە پابەند بووین بەشتێکەوەو هەستاوین بە پەیڕەوکردنو ئەنجامدانیو زۆریش پێمان دروست بووە، وەلێ پشتی ماوەیەك کە بیرمان لێ کردووەتەو بە قوڵی لێی وردبووینەوە ئەو ساتە زانیومانە کەچەندە بە هەڵە شتێکی بێماناو نالۆجیکیمان ئەنجام داوە. جابۆیە تاکو زیاتر بیر بکەینەوە کەمتر پەنجەی پەشیمانی دەگەزین!

لەبەرئەوەپێویستەلەسەرهەریەکێکمان کە هەرشتێك لە ژیاندا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، بۆ نموونە: (پەیڕەوکردنی خوو نەریتێکی کۆمەڵایەتی، پابەندبوون بە ئاینو ئایدۆلۆژیایەك، ئەنجامدانی پرۆژەو کردارێك، یان...) سەرەتا لەگەڵ کەسانی شارەزاو لێهاتوودا ڕاوێژێکی باشیان لەسەر بکەین، دواتر خۆمان لە جێگەیەکی هێمنو بێدەنگ دیالۆگێکی چڕوپڕ لەگەڵ خودی خۆماندا بکەینو ئینجا بڕیار بدەین، بە لەبەرچاوگرتنی بەها جوانەکانی کۆمەڵگە. نابێت هیچ کاتێك ئێمە بڵێین لەبەرئەوەی زۆربەی خەڵکی ئەمە دەکات و ئاوا دەکات، بۆیە منیش وەکو ئەوان دەکەم! نا بەڕێزەکەم با ئاوا بیرنەکەینەوە، چونکە دەشێ هەموو ئەم خەڵکانە هەڵە بن تەنیا تۆ ڕاست بیت.

لەبەرئەوە دەبێ بڕوای تەواومان بە خۆمان هەبێتو نابێت ڕێگە بدەین هیچ کەس بیرو بڕیارمان بۆخۆی قۆرخ بکاتو بە کاری بهێنێت. زۆر گرنگە کاتێك مرۆڤ بیر دەکاتەوەو لەگەڵ خودی خۆیدا گفتوگۆ دەکات لە بارەی هەر لایەنێك لە بوارەکانی ژیاندا ئەم پرسیارانە لە خۆی بکات: (بۆچی؟ چۆن؟ سودی چییە؟ زیانی چییە؟) هەرساتێکیش وەڵامی تەواوی خۆمان دایەوە، ئینجا بڕیار بدەین، بەم شێوەیە بەشێکی زۆر لەحەقیقەتمان دەست دەکەوێت، ئەگەر بە حەقیقەتی ڕەهاش نەگەین. سەرەڕای ئەوەی کە دەبێت هزرکردنو خەیاڵەکانمان گشتگیرو هەمەلایەنە بنو تەنیا لەچوارچێوەی بابەتێكو بوارێکدا نەخولێنەوە، پێ دەچێت بایەخێکی زیاتریش بەم شتانە بدەین کە گومانمان لێیان هەیەو نارۆشننو چەواشە کراون، جا بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان بێت.

عەقڵو بیرکردنەوە گەورەترین سەرمایەی مرۆیی مرۆڤن، چەندە زیاتر بەکاریان بهێنین ئەوەندەش زیاتر هەست بەڕاستییەکان دەکەینو عەقڵمان فراوانتر دەبێتو دەگەینە حەقیقەتو بڕیارێکی دروست.

بەشی دووەم و کۆتایی

# فەلسەفەی کاری دامەزراوەیی و تایبەتمەندییەکانی

و: عومەر عەبدولقادر

دووەم/ تایبەتمەندییەکانی کاری دامەزراوەیی: ئەو شێوازو کارکردنە دامەزراوەییەی کە لەم بابەتەدا بانگەشەی بۆ دەکەین، بە کۆمەڵێك خەسڵەتو تایبەتمەندیدا دەناسرێتەوە کە وای لێکردووە ببێتە جۆرە کارکردنێکی جیاواز، گرنگترین ئەو تایبەتمەندیانەش بریتین لە:

١- کاری دامەزراوەیی، جێگیری کارو بەردەوامبوونو پارێزگاریکردن لە ئەزموونو پسپۆڕیو زانیارییەکان لە خۆ دەگرێت، گۆڕانکاریکردن لە سەرکردایەتییەکەی کاریگەری لەسەری نابێت، ئەگەر هاتوو کارگێڕییەکەی بدرێتە دەست کەسانی لێهاتوو و شارەزاو پسپۆڕی خاوەن بەجێهێنانی بەرزی پیشەیی.

٢- کاری دامەزراوەیی ڕێگر دەبێت لە تاکڕەویی سەرکردە (یان سەرکردایەتیکردن) لە دەرکردنی بڕیارە چارەنوسسازەکانی پەیوەست بە دامەزراوەکەوە، لە هەمان کاتدا پشت دەبەستێت بەو لایەنە تایبەتمەندانەی کە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی یارمەتیدەر ئامادە دەکەنو دەیخەنە بەردەست دەستەی کارگێڕی دامەزراوەکە.

٣- کاری دامەزراوەیی پارێزگاری لە سەقامگیری کارگێڕیو دارایی دامەزراوەکە دەکات، ئەمەش لە میانەی پەیڕەوکردنی کۆمەڵێك ڕێکخەری کارکردنەوە (ڕێوشوێنو بنەماو بەرنامەڕێژی) کە کار لەسەر ئامرازو ئامانجەکان دەکات، کە هاوڕان لەگەڵ دیدگەی دامەزراوەکە.

٤- کاری دامەزراوەیی، هەموو ئەو کارمەندانەی کاری تێدا دەکەن، پابەند دەکات بە سیستەمێك لە بەهاو بنەماکان کە بە جێهێنانو ئاکارو پەیوەندییە وەزیفیو مرۆییەکانیان ڕێکدەخات.

٥- لە کاری دامەزراوەییدا دەستەی کارگێڕی هەوڵ دەدات باشترین شێوازی تیۆری کارگێڕی هەڵبژێرێت، کە باشترین ئاستی خزمەتگوزاریی پێشکەش بکاتو زۆرترین بڕی قازانج بە دەستبهێنێت.

٦- کاری دامەزراوەیی بە باشترین داهاتی مرۆیی پاڵپشتی دامەزراوەکە دەکات، ئەمەش لە ڕێگەی پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی پەرەسەندوو لە هەڵبژاردنو بە گەڕخستندا، پەیڕەوکردنی شێوازێکی بەرنامەڕێژ بۆ ڕاهێنانو مەشقکردن کە بە دیهێنەری گەشەپێدانێکی پیشەیی بەردەوام بێت.

٧- کاری دامەزراوەیی جەخت دەکاتەوە لە سەر ئامادەیی دامەزراوەکە لە پێشکەشکردنی سەرکردەی یەدەگ لە کاتی پێویستو کتوپڕدا، یان لە کاتی تووشبوونی دامەزراوەکە بە قەیرانە جیاوازەکان، یاخود لە دۆخی کتوپڕو لە ناکاودا توانای گۆڕانکاریو ئاڵوگۆڕکردنی هەبێت.

دامەزراوەکانو ئایندە:

جیهانی ئەمڕۆ بە فاکتەرەکانی گۆڕانکاریو پەرەسەندنی بواری تەکنەلۆجیای زانیاریو پەیوەندییەکان جیادەکرێتەوە، کە کاریگەری کارای لەسەر هەموو لایەنەکای ژیان دروستکردووەو توانیویەتی تا ڕادەیەکی زۆر زاڵبێت بە سەر هەموو بوارەکانی بەرهەمهێنانو کارگوزاریو خزمەتگوزارییەکانو ژیانی گشتیو تایبەتدا.

ئەم پەرەسەندنو گۆڕانکاریانەش چەندین ئاراستەو شێوازی تازەی لە بواری کارگێڕیدا بەرهەمهێناوە کە خاوەنی خەسڵەتو تایبەتمەندی جیاکەرەوەی خۆیانن کە لەگەڵ جیهانی ئەمڕۆدا دەگونجێت.

لە دەرئەنجامی ئەم گەشەکردنەو پێشکەوتنەدا کۆمەڵێك خەسڵەتو جیاکەرەوە بوونە ڕووخساری کارگێڕی سەردەم کە لەوەو پێش نەبوون، یان هێندەی ئێستا گرنگیان پێ نەدراوە، وەك: ڕێزگرتنی مرۆڤو وەبەرهێنانی وزەو تواناکانی، پەیوەست بوون بە بازاڕەوە، هەوڵدان بۆ جیاکاریو شێوازی جیاکەرەوەو کێبڕکێکردن، قبوڵکردنی گۆڕانکاری پەسەند، ڕازیکردنی هەمیشە کڕیاران، گرنگیدان بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییەکان، نوێبوونەوەو دەستپێشخەریو کرانەوە بە ڕووی جیهانی پەرەسەندنو گۆڕانکارییەکاندا، جەختکردنەوە لەسەر جۆری کوالێتی، وەبەرهێنانی زانیارییەکان، گرنگیدان بە دامەزراوەی قەبارە بچووكو مامناوەند، هەروەها پەیڕەوکردنی سیستەمی لامەرکەزی، ئامادەبوونو هەنگاونان بەرەو ئایندە، بەڕێوەبردنو بەسەر ڕاگەیشتنی ئەم خەسڵەتو جیاکەرەوانەش پێویستی بە دارشتنی بەرنامەو ستراتیژییەتی کارگێڕی نوێ هەیە، کە لەگەڵ گۆڕانکاریو گەشەسەندنە خێراکانی جیهانی نوێدا بگونجێت.

سەرچاوە/ العمل المؤسسي/ د. محمد أكرم العدلوني.

# لێهاتووییەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا

بەشی دووەم

ن: د. طارق السویدان
و: دڵشاد محەممەد

**دووەم/ کارتێکردن لە مرۆڤ:**

لە ژمارەی ڕابرووودا باسمان لە مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵك کردو گرنگی ئەو کارەشمان لە پرۆسەی کارگێڕیی‌و سەرکردایەتیدا ڕوونکردەوە، باسمان لەوەشکرد کە جوان هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا پێویستی بە چەندین لێهاتوویی جۆراوجۆر هەیە، هەروەها یەکەم لێهاتووییشمان باسکرد کە بریتی بوو لە (تێگەیشتن‌و پەیوەندی لەگەڵ بەستن)، ئەمجارەش بە پشتیوانی خودا قسە لەسەر لێهاتوویی دووەم دەکەین ئەویش لێهاتوویی (کارتێکردن)ە...

**لێهاتوویی (کارتێکردن لە مرۆڤ) لە ڕێگەی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەستەبەر دەبێت:**

١- سۆز جوڵاندن: ئەگەر باوەڕمان بەوەهێنا کە سەرکردایەتی بریتییە لە "هونەری بەڕێوەبردنی خەڵك‌و ئاڕاستەکردنیان بەرەو ئامانج"، ئەوا کارێکی زۆر گرنگ‌و پێویست دەبێت کە کار لەخەڵکی بکەین بەرەو هێنانەدی ئەو ئامانجەی مەبەستمانە بیانجوڵێنین.

سۆزوعاتیفە بە دەمەوانەی ئاسودەیی پەیوەندییەکان لەگەڵ خەڵکانی تر دادەنرێت، بزواندنی ئەو سۆزەش پێویستی بە ئاشنابوونی سەرکردەیە بە سروشتی مرۆیی‌و تێگەیشتن لە پێویستی‌و پێداویستییەکانیان، هەروەها جوڵاندنی سۆز بە تایبەتی لە کاتی قەیرانەکاندا کارێکی زۆر گرنگە.

٢- گرنگیدان بە مرۆڤ: گرنگیدان بە مرۆڤ یەکێکە لەو کارانەی کە زۆر کاریگەرە بۆ سەر دڵەکان، ئێمەش دەمانەوێت کۆمەڵگەیەك دروست بکەین کە تەواوی مانا مرۆییەکانی تێدا بەرجەستە بێت، کۆمەڵگەیەك کە ڕێز لە مرۆڤ‌و مرۆڤایەتییەکەشی بگرێت.. ئەوەتا پێشەوا (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) گرنگی‌و زەرورەتی پەرۆشبوون‌و گرنگیدان بە هەژارو نەدارو کرێکارو کۆی خەڵکیمان بۆ ڕووندەکاتەوە، کاتێك داوای هەندێك پارەوسامانیان لێکرد بۆ پەردەو بەرگی کەعبە، فەرمووی: "من پێموایە ئەو پارەیە بدەمە خەڵکانێکی برسی باشترە لەوەی بیدەمە پەردەی کەعبە".. بەڵێ، ئیسلام تا ئەو ئەندازەیە ڕێزی لە مرۆڤ گرتووە.

٣- قەناعەتپێکردن: ئەویش بەوەی هانی خەڵکانی تر بدەیت لەسەر تێگەیشتن لە بیروبۆچوون‌و تێڕوانینت‌و قبوڵکردنیشی، پاشانیش پشتگیری‌و پشتیوانی لێکردنت لەو زانیارییانەی دەتەوێت بۆیان، ڕەنگە تۆ هەندێك شتی ڕاستی‌و واقیعییان پێ بگەیەنیت، یاخود چەند ئاکام‌و دەرەنجامێکی ڕاستەقینەیان بۆ ڕوونبکەیتەوە، ئەویش لە ڕێگەی چەند بەڵگەیەکی ماددی‌و بەرجەستە، بێ ئەوەی بە فیزو خۆبەزلزانینەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەیت.

٤- ئەمەکداری: ئەو وشەیەیە کە زۆرێك لە دامەزراوەو دامودەزگا پیشەیی‌و خێرخوازییەکان لەبیریانکردووە، زۆرجار دەبینیت لە دامودەزگایەکدا فەرمانبەرو کرێکارەکانی بەهاری تەمەن‌و گەنجی خۆیان لە پێناو بەرەوپێشبردن‌و سەرخستن‌و بەرزکردنەوەی ناوی دەزگاکەیاندا سەرفکردووە، بەڵام لەولاوە دەبینی دامودەزگاکە جۆرەها فشاری یەك لە دوای یەك دەکاتە سەریان، تا لە کۆتایی ڕێدا دەست لەکارکێشانەوەی خۆیان ڕابگەیەنن.. خۆ ئەگەر هاتوو لە دوای دەست لەکارکێشانەوەیان دامەزراوەکە ڕێزێکی لێنان، ئەوا لە بڕوانامەیەکی ڕێزلێنانی بێبایەخ زێتر تێپەڕناکات..

ئێمە قەناعەتی تەواوەتیمان هەیە بەوەی، ئەو گرفتو کێشە کارگێڕییانەی ئەمڕۆ پێوەی دەناڵێنین پێویستی بە کەمێك وەفاو ئەمەکداری‌و مانای مرۆیی هەیە..

ئەمەکداریش پێویستی بە نمایش‌و نواندن نییە، چونکە ئاکارێکی ڕەسەن‌و دەلالەت لە دەروون بەرزی‌و ڕەوشتبەرزی دەکات‌و لە کاتی ناڕەحەتی‌و تەنگانەدا دەردەکەوێت، ئەوەتا پێشەوا شافیعی دەفەرموێت: "سەربەست ئەو کەسەیە موراعاتی خۆشەویستی ساتێك دەکات، یا هەوادارو لایەنگریی ئەو کەسەیە کە وتەکانی سوودیان پێگەیاندووە".

٥- سیحری هۆگربوون: زۆرجار مرۆڤ بە قەیرانگەلێکی دەروونی ئاڵۆزدا تێدەپەڕێت‌و پێویستی بە کەسێك هەیە تا ئاسۆرو ناڕەحەتییەکانی خۆی بۆ باسبکات‌و دەردەدڵی خۆی لە لا بکات، ئیدی ئەو کات هەست بە ئاسوودەییەکی تێکەڵاو ئاوێزان بە سیحری ئولفەت‌و هۆگربوون دەکات، ئەوە خەلیفە مەئموونە کاتێك (مەخاریق)ی هاودەم‌و هاوەڵی شیعرێکی ئەبولعەتاهیەی بۆ دەخوێنێتەوە کە دەڵێت: "بەڕاستی من پێویستم بە سێبەری هاوڕێیەکە کاتێك لێی زویر دەبم دڵسۆزو دڵسافە بەرانبەرم".. مەخاریق دەڵێت: خەلیفە پێی وتم: دووبارەی بکەرەوە، منیش حەوت جارم بۆ دووبارە کردەوە. دواتر پێی وتم: ئەی مەخاریق خیلافەتم لێوەربگرەو ئەو هاوڕێیەم بدەرێ.

بە پشتیوانی خودا، لە ژمارەی داهاتوودا باس لە لێهاتوویی سێیەم لە لێهاتووییەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکی دەکەین، ئەویش لێهاتوویی (هاندان)ە.

و: ئەسکەندەر ڕەحیم

# هەندێك لە بۆچوونە پووچەكانی كارگێڕی

ئاخۆ لە دەستەیەكی كارگێڕیدا.. یاخود لە بەشێكی بچووكی كۆمپانیایەكی گەورەدا، توانای گەمەی گەورەی كارگێڕیت هەیە؟ بێگومان بەڵێ.. بەڵام ئەركی سەرشانتە، ئەم كۆمەڵە بۆچوونە پووچە بەسەرچووەی خوارەوە.. كە دەبنە ڕێگر لە بەرەو پێشچوونی كارەكانت، لە بیری خۆت دەربكەیت:

**١- كاتێك ڕاستیت بۆ خەڵكی ئاشكرا كرد.. ئەوا زوو ئەم هەڵە دەقۆزنەوەو خراپ بەسەرتدا دەشكێتەوە.**

بەڵام ڕاستەقینەكەی ئەمەیە: درۆ دەردێكی درمەو وەك ئاگر بەردانە لە پووشو پەڵاش. خۆ ئەگەر درۆت كردە پیشە.. ئەوا كار دەگاتە ڕادەیەك.. تێیدا متمانەی هەمووان لە دەست دەدەیت. هەر كاتێكیش لەگەڵ خەڵكیدا پاكو سەرڕاست بوویت.. متمانەت پێ دەكەنو پشتت پێ دەبەستن.. دواتریش باوەڕ بە هەر وشەیەك دەكەن كە لە زارت دێتە دەر، چونكە تۆ كەسێكی خاوەن متمانەو ڕاستگۆیت.

**٢- نەرمو نیانیو خۆشەویستی دەربڕین، لە مامەڵەكردن لەگەڵ خەڵكدا.. سەری لە زیانو ڕەنجەڕۆییەوە.. دەردەچێت.**

بەڵام ڕاستەقینەكەی: ئاكامی خۆپەسەندیو لە خۆبایی بوونو تۆقاندنی كەسانی دی، نەمانی دەسەڵاتە. ئەو بەڕێوەبەرانەی بەو كەسایەتییە توندو تیژەیان، كە هەمووان لێی ترساون، دەنازن.. هەر لە فیشەكە شێتەو یارییە ئاگرینەكان دەچن.. گڕ دەگرنو بە توندی دەتەقنەوە.. بە خێراییش دەكوژێنەوە. هەر كە تەقینەوەو بە ئاسماندا پەرشوبڵاوبوونەوە.. كارمەندەكان دەیكەنە چەپڵە ڕێزانو لە خۆشییاندا.. پێیان زەوی ناگرێت.

**٣- وەك بەڕێوەبەرێك، تۆ لە وەڵامدانەوەی هەر پرسیارێك.. یەكەم بەرپرسو تاكە بەرپرسیت.**

ڕاستەقینەكەشی ئەوەیە: ناشێ تەنها كەسێك.. بتوانێت وەڵامی گشت پرسیارەكان بداتەوە.. بۆیە متمانەی كارمەندەكان بە خۆیان توندو تۆڵ بكە.. ئەوەش دووپات بكەرەوە.. كە تۆ زاناترینی زاناكانو شارەزاترینی شارەزاكانو چاكترین بەڕێوەبەری ناو بەڕێوەبەرەكان نیت.. هەروەها لە چارەسەركردنی گرفتەكاندا، كارمەندەكانت بەشداری پێ بكە.. چونكە پاشتر دەبینیت.. كۆمەڵێك توانا دەخەنە كار.. سەرسامیو خۆشیت پێ دەبەخشن.

**٤- خێرا پلەبەرزكردنەوەی كارمەندەكان.. پێویست ناكات.**

بەڵام ڕاستییەكەی ئەوەیە: بەوپەڕی گورجو گۆڵییەوە.. پەلە بكە لە پلە بەرزكردنەوەی كارمەندەكانت.. چونكە كاتێك كارمەند لە ئەنجامدانی هەمان كاردا، بۆ ماوەیەكی درێژ دەمێنێتەوە.. لەسەر یەك شێواز ڕادێت. كاتێكیش پلەی كارمەندەكان بەرز دەكەیتەوەو بۆ كەرتو بەشەكانی دی، دەیانگوێزیتەوە.. ئەوا مەشقیان لەسەر لێهاتووییە جیاوازەكان، پێ دەكەیت.. هەروەها تۆڕێكیش لە شارەزایی زۆرو جیاواز دروست دەكەیت.. كە لەو كاتانەی گرفت هەیە، یان پێویستت بە یارمەتی هەیە.. پەنایان بۆ دەبەیت.

**٥- گرفتە گەورەكان پشتگوێ بخەو لە كاری خۆتدا.. قاڵ ببەوە.**

بەڵام ڕاستەقینەكەی ئەوەیە: ئەگەر ویستت خەڵكی بەر پێی خۆیان ببینن.. دەبێ سەرەتا سەریان هەڵببڕن.. ئەوانەی بۆ دوور دەڕوانن.. گوێ نادەنە ئەو بەردانەی لە دەوروبەریاندا تەخشانو پەخشان بووە. بۆیە لە كارمەندەكانت بگەڕێ.. تا بە تەواوەتی وێنەی بارودۆخەكە ببینن. دیسانەوە لە زانینی هەموو ڕاستییەكاندا بەشدارییان پێ بكەو ململانێو كێبەركێ لە ڕێگەیاندا بچێنە.. وازیشیان لێ بهێنە.. تا هەست بە خۆشی سەركەوتن بكەنو تامی سەربەرزی بچێژن.

سەرچاوە: خلاصات: ژمارە/ ٦٩

و: ئاوات جەمال

# وەك وتاربێژێك خەڵكی چۆن گوێت بۆ دەگرن؟

١ _ ٢

* چی بکەیت بۆئەوەی گوێت لێ بگرن؟
ئەگەر دەتەوێت وتاربێژێکی سەرکەوتوو بیت لە کۆڕو کۆبوونەوەو سیمینارەکاندا لە کاتی گفتوگۆکردندا هەستو سەرنجی گوێگران بۆ وتەو قسەکانت ڕابکێشیت، ئەوا ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکە:

١- گوێگرانت بناسەو ئامانجەکانت دیاری بکە: ئەوان کێن؟ داوای چ جۆرە بابەتێکت لێ دەکەن؟ مەبەستیانە چی لە تۆ ببیستن؟ بە چ شێوەیەك گوێت لێ دەگرنو حەز دەکەن بە چ شێوازێك وتارەکەیان پێشکەش بکەیت؟ ئایا ئەوەی دەیڵێیت، بایەخی پێ دەدەن؟

٢- شێوازی پەیوەندی کردن فێر بە: هەر کەسەو شێوازێکی تایبەتی پەیوەندیکردنی خۆی هەیە، جا شێوازی پەیوەندی کردنی کەسێتی تۆ چۆنە؟ لەبەرئەوە پێویستە ئەم شتانە بزانیت: جۆری وشەکانو کاریگەری شێوازی دەربڕینو تۆنی دەنگت، چۆنییەتی هەڵسوکەوتت، تەنانەت جوڵەی لاشەت، تا بەتەواوی سەرنجی گوێگران بە لای وتارەکەتدا ڕابکێشیت.

٣- گوێگرانت بخەرە وێنەوە: زمانێکی پاراوو زیندوو بە کاربهێنە، ئەو بابەتەی باسی دەکەیت، تەواوی بکە، بە وشەکانت وێنەیەکی وەها بکێشە بۆ گوێگرانت، تا بە تەواوی گوێبیستت بن، دەنگی بەرزونزم بە کاربهێنە، بابەتەکەت زۆر دوورودرێژمەکەرەوە.

٤- باوەڕیان پێ بهێنە: یەکەمجار باوەڕت بە خۆت هەبێت، بە وشەکانت، بە شێوازی دەربڕینو تۆنی دەنگت، پاشان زیادەڕۆیی مەکە لە باسکردنی بابەتەکەو ئەوەندەی پەیوەندی بە گوێگرانی باسەکەوە هەیە لێی بدوێ، تا پێت نەڵێن: ئەم هەمو باسو خواسە چییە، ئێمە چیمان لەمە دەست دەکەوێت.

٥- ڕووخۆش بە لەگەڵ گوێگرانتدا: هاوکاری گوێگرەکانت بکە، تاوانیان مەخەرە پاڵ، بە چاوی کەم سەیریان مەکە، مەبەستی قسەکانت ئاڕاستەی کەسێکی دیاریکراو مەکە، گاڵتە بە ڕاوبۆچوونی کەس مەکە، زۆر بە چاکی گوێیان بۆ ڕادێرە، بە ناوی خۆیانەوە بانگیان مەکە، کارێك بکە بە بیستنی قسەکانت دڵخۆش بن.

٦- ئاگاداری شوێنو کات بە: کاتێك ئامادەبووان دەیانەوێتو ئامادەن، قسەیان بۆ بکە، نەك تەنها ئەو کاتانە قسەیان بۆ بکەیت کە خۆت دەتەوێت، شوێنێك ئامادە بکە کە گونجاو بێت بۆ ئەوانو بۆ خۆشت، چونکە گونجاوی شوێن ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لە سەرکەوتنی وتاردا.

٧- ئەنجامەکان هەڵسەنگێنەو بە دواداچوونیان بۆ بکە: ئەنجامی وتارەکەتو وتوێژەکەت لەگەڵ گوێگراندا چی بوو؟ ئایا لێت تێگەیشتوون؟ ئەگەر وەڵامەکەت (بەڵێ)یە، هۆکاری سەرکەوتن دەستنیشان بکەو برەوی پێ بدە، ئەگەر (نەخێر)ە، هۆکارەکەی دەستنیشان بکەو هەوڵی چارەسەرکردنی بدە...

* یەکێك لە خەسڵەتە دیارەکانی وتاربێژی سەرکەوتوو گوێگرتنە، بە گوێگرتنی وتاربێژ لە ڕاوبۆچوونو سەرنجی گوێگرانی پەسەندیو هۆگریو ڕەزامەندییان بە دەست دەهێنیت، ئەم چەند خاڵەی دواتر یارمەتیدەر دەبن بۆئەوەی ببیت بە گوێگرێکی باش:

١- لە کێشە بە دوور دەبیت:
گوێگری بە سەلیقە زۆر بە باشی ئاگاداری ڕێنماییو زانیارییەکانی دەوروبەریەتی، پێشنیارو سەرنجو تێبینییەکان بە هەند وەردەگرێت، بە گشتی خەڵکی ئارەزووی گوێبیستی کەسێك دەبن کە بایەخیان پێ بدات.

٢- ئاگاداری دەوروبەت بە: ژیان قوتابخانەیەکە لە ڕێگەی ئەزموونەکانەوە گەلێك شت فێر دەبیت بە درێژایی تەمەنت، چەندێك خاوەن ئەزموونو گوێڕایەڵی وتەو گوفتاری چاك بیت، زیاتر شارەزاو ئاگاداری دەوروبەرت دەبیتو کەسایەتیت بەهێزتر دەبێت.

٣- زیاتر بە توانا دەبیت: هەرچەند زانیاریت سەبارەت بە کارەکەت زۆرتر بێت، زیاتر بە سەرکەوتوویی ئەنجامی دەدەیت، گوێگرتن یەکێك لە باشترین ڕێگاکانە بۆ

به دەستهێنانی زانیاریو مەعریفە.

٤- زیرەکیت زیاتر دەردەکەوێت: گوێگرتن تەنها زانیاریت زیاد ناکات، بەڵکو وات لێ دەکات کە زیرەکتر بیت، بڕوانە ئەو کەسانەی خاوەنی زانیارینو وتار پێشکەش دەکەن، زۆر جیاواز ترن لە کەسانێك کە بێ زانیاری وتار پێشکەش دەکەن..

٥- هێزت زیاتر دەکات: (مەعریفە هێزی تۆیە) ئەم هێزەش لە ئەنجامی گوێگرتنەوە دێتە دی، تا مەعریفەت زیاتر بێت باشتر دەتوانیت بڕیاری ئازایانە بدەیت، چونکە پشت ئەستوریت بە مەعریفەو زانیارییەکانت.

٦- دەتوانی زیاتر بچیتە دڵی خەڵکییەوە: گوێگرتن بۆ خەڵکی، دەبێتە هۆی ئەوەی زیاتر بە دەمتەوە بێن، چونکە تۆ ئامانجی ئەوان دەهێنیتە دی، بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی بەڕێوەبەرەکەت گوێگرتن ئامرازێکی زۆر گونجاوە..

٧- ڕێزی زیاتر بە دەست دێنیت: ڕەنگە زۆرجار لە کەسێکت بیستبێت، دەڵێت: (تەنها گوێم لێ بگرە)، ئەو وات لێ دەکات هەست بە ڕێزگرتنی بکەیت، لە بەرامبەر گوێگرتنت بۆی.

٨- کاری ڕاسپاردن ئاسان دەکات: دووخاڵ زۆر گرنگن گەر بتەوێت داوایەك لە خەڵکی بکەیت، ئەوانیش:

یەکەم: داواکارییەکەو شێوازی دەربڕینی وشەکان دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی بە باشی گوێت بۆ ڕابگرن.

دووەم: لەوەش گرنگتر گوێگرتنی تۆیە بۆ ئەوان، کەواتە نابێت تەنها تۆ قسەکەر بیت.

٩- توڕەیی خەڵکی بە ئاسایی وەربگرە: هەوڵ بدە توانای گلدانەوەی توڕەیی بەرامبەرەکانت هەبێت، لێیان تێ بگەو بزانە بۆچی توڕەن، هۆکار چییە؟ لە بەرامبەردا بە توڕەیی وەڵامیان مەدەرەوە.

١٠- ڕێزو پلەو پایەت بەهێزتر دەبێت: کاتێك تۆ لە کاتی خۆت تەرخان دەکەیت، بۆ وەڵامدانەوەی کەسێك بەمە ڕێزو پایەی خۆتو بەرامبەرەکەشت دەگریت، ئەگەر بە ڕوویەکی خۆشەوە بە دەمییەوە چوویتو گوێت بۆ گرت، ئەوە دڵسۆزیو لایەنگری ئەو کەسە بە دەست دەهێنیت.

١١- خۆشەویستی کەسانی ترت بۆ دەسازێنێت: خەڵکی کەسێکیان خۆشناوێت کە گوێیان بۆ ناگرێت، باشترین دیاری بۆ خۆشەویستیو بایەخ پێدان دیاری گوێگرتنە.

# دە نەریت بۆ پێکهێنانی کەسایەتی سەرکەوتوو

هەندێك نەریت و عادەت هەن باڵدەکێشن بەسەر کۆمەڵگەدا، بەشێکیان پۆزەتیفن و بەشێکی تریان نێگەتیف، پێویستە هەمیشە هەوڵبدرێت نەریتە خراپ و نێگەتیفەکان بگۆڕدرێن و چاك بکرێن، ئەم هەوڵ و گۆڕانەش بۆ خۆی نهێنی سەرکەوتنی خەڵکانێکە لە ژیاندا، لێرە ئاماژە بە (١٠) نەریت دەکەین کە دەبێتە هۆی دروستکردنی کەسایەتییەکی سەرکەوتوو:

نەریتی یەکەم: هەوڵدان بۆ جیاوازبوون و تایبەتمەندبوون لە کارچاکیدا، بەشێوەیەك هەر کارێك ئەنجامدرا بە چاکی و پاکی و ڕێکوپێکی بکرێت.

نەریتی دووەم: دیاریکردنی ئامانج و مەبەستەکان، چونکە دەروازەیەکە بۆ بەرچاوڕوونی و هەنگاونان و کۆششکردن.

نەریتی سێیەم: ڕێکخستنی کاروبارەکان بەپێی گرنگی و پێشینەیی، هەر کارەو لە کات و شوێنی خۆیدا ئەنجام بدرێت.

نەریتی چوارەم: دانانی نەخشەو پلان، ئەمەش سەرەتایەکە بۆ بە ئاکام گەیشتن و دوورکەوتنەوە لە کاری بێسەرەو بەرەو هەرەمەکی.

نەریتی پێنجەم: بوونی تەرکیز لە ئەنجامدانی کارەکاندا، تا بتوانرێت بە ڕێکوپێکی و بێ کەموکورتی کاروبارەکان ئەنجام بدرێت.

نەریتی شەشەم: ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کات بە ڕێکوپێکی، چونکە هەر ساتێك بەسەرتدا گوزەر دەکاو تێپەڕ دەبێت، بەشێك لە تەمەنت لەگەڵ خۆیدا دەبات.

نەریتی حەوتەم: بەرەنگاری و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەرووندا (النفس)، چونکە کەسی سەرکەوتوو، جڵەوی دەروونی خۆی دەگرێت، نەك بە ڕەهایی ملکەچی خواستەکانی دەروونی بێت.

نەریتی هەشتەم: لێهاتوویی و شارەزایی لە بواری پەیوەندیی گرێدان لەگەڵ کەسانی دەوروبەرو جوان مامەڵەکردن لەگەڵیاندا.

نەریتی نۆیەم: بیرکردنەوەی پۆزەتیفانەو هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی کاری باش و چاك، ئەگەرچی لە ناڕەحەتترین ساتەوەختیشدا بێت.

نەریتی دەیەم: هاوسەنگی ڕاگرتن لە کاروبارەکاندا، بە جۆرێك کە بە فیرۆدان و تێپەڕاندان (إفراط و تفریط) لە هیچ کارێکدا نەکرێت و هەر شتێك مافی خۆی بدرێتێ.

# سوسو

## کیسەڵە بچکۆلانەکە !!

پەیمان

کۆمەڵێك کیسەڵ لە دارستانێکی بچکۆلانەی نزیك ڕووبارێکدا دەژیان، دەیان ساڵ بوو کیسەڵەکانی نێو ئەو دارستانە پێکەوە بەختەوەرانە ژیانیان دەگوزەراند..

دارستان زۆر هێمنو ئارام بوو، کیسەڵەکان زۆر بە هێواشیو بەبێ ژاوەژاوو دەنگە دەنگ، ڕۆژانە بە نێودارستانەکەدا پیاسەیان دەکرد..

کیسەڵێکی بچکۆلانە کە ناوی (سوسو) بوو، حەزی دەکرد بچێتە دەرەوەی دارستانەکەو بەرەو دەشتو دۆڵەکانی دەوروبەر بڕوات..

(سوسو) جارێکیان کەروێشکێکی بچکۆلانەی بینی زۆر بە جوانیو بە سەربەستی ڕای دەکردو بازی دەداو یاری دەکرد..

ئاخێکی هەڵکێشاو وتی: خۆزگە منیش دەمتوانی وەکو ئەو بجوڵێمو ڕابکەم، بەڵام ئەم قاوغە ئەستورو سەنگینەی پشتم ڕێگەم نادات، وەکو کەروێشك بە دڵخۆشی ڕابکەمو باز بدەم.. ئاە.. خۆزگە دەمتوانی لەو قاوغە سەنگینو ئەستورە ڕزگارم ببێت..

سوسو ڕۆیشت بۆ لای دایکیو سکاڵای حاڵی خۆی بۆ کردو پێی گوت: دایەگیان دەمەوێت ئەم کۆڵە قورسەی سەرشانم داکەنم..

دایکی وتی: ئەوە بیرۆکەیەکی بێ مانایە، ئێمە ناتوانین بەبێ قەپاغەکەی سەرپشتمان بژین، ئێمەی کیسەڵ لەو ڕۆژەوەی خوای گەورە دروستی کردووین بەم شێوەیە دەژین، هەر ئەو قەپاغەیە ئێمە لە گەرماو سەرماو زیان دەپارێزێت..

سوسو وتی: بەڵام بەبێ ئەم قەباغە قورسە ئێمە جوانتر دەبین، وەکو کەروێشك، ئەو کات دەتوانین بە سەربەستیو سادەیی بژین..

دایکی وتی: تۆ لە هەڵەدایت، ئەمە ژیانی سروشتی ئێمەیە، هەرگیز ناتوانین بیگۆڕین..

سوسو بڕوای بە قسەکانی دایکی نەکرد، هەربۆیە بڕیاریدا ئەو قەپاغە قورسە لە لەشی دابڕنێت، ئەگەرچی بەهێزیش بێت!

دوای چەندین جار هەوڵدان، خۆی خستە نێوان دوو درەختی نزیك یەکەوە، هێزی دایە خۆیو قەپاغەکەی لە پشتی کردەوە، پشتی نەرمو تەنکی دەرکەوت، هەرچەندە سەرەتا هەستی کرد لاشەی سووكو چالاك بووە...

لەبەرئەوە هەوڵیدا لاسایی کەروێشکە جوانەکە بکاتەوە، بەڵام هەر جارێك کە دەڕۆیشت، یان بازی دەدا، هەستی بە ئازارێکی زۆر دەکرد، سوسو هەوڵی دا بازێکی درێژ بهاوێژێت، بەڵام کەوتە سەرزەویو نەیتوانی هەڵسێتەوە..

دوای ماوەیەك زیندەوەران لێی نزیك بوونەوەو لەسەر پشتی تەنکی کۆبوونەوە...

سوسو بە هۆی ئەو زیندەوەرانەوە هەستی بە ئازارێکی زۆر کرد...

یادی ئامۆژگارییەکانی دایکی کردەوە، زۆر پەشیمان بوو کە لە قسەی دایکی دەرچووەو گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی نەکردووە، بەڵام بە داخەوە کات تێپەڕیوەو پەشیمانی دادی سوسوی نەدا...

منداڵە چاوگەشەکان وەك زانیمان پەشیمانی دادی سوسوی نەداو کات تێپەڕی بوو، بەڵام بۆ تۆی ئازیز هێشتا کات تێنەپەڕیوە، بزانە ئاکامی گوێڕایەڵی نەکردنی ئامۆژگارییەکانی دایكو باوك دووچاری ناخۆشیو نارەحەتیت دەکات، کەواتە هەموو کات گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بابەو دایە بە، بە بێ پرسو ڕاوێژی ئەوان هیچ کارێك ئەنجام مەدە.. بە هیوای ژیانێکی خۆش!

سەرچاوە: www.2lex.com

# زریانی لماوی!!

و: محەمەد مێرگەیی

زریانە لماوییەکان لە کاتی هەڵکردنی بای بەهێزدا ڕوودەدەن، ئەو بایانەی کە لەگەڵ خۆیاندا لمی سەر ڕووی زەوی هەڵدەگرن و دەیگوازنەوە. زریانە لماوی و زریانە خۆڵاوییەکان مەترسیدارن، چونکە ئاووهەوا پڕ دەکەن لە تەنۆچکەی بچووکی خۆڵاوی، ئەمەش دەبێتە هۆی سەختی و دژواری بینین و هەناسەدانی سروشتی لە لای مرۆڤەوە. زریانە لماوییەکان بە یەکێک لە کارەساتە سروشتییەکان دادەنرێت کە دەبێتە هۆکاری زۆر ڕووداوو دروستبوونی پاشماوەکان، هەروەها دەبێتە هۆکاری دروستبوونی زۆر ڕووداوی هاتووچۆی ئۆتۆمبێل و فڕۆکەکان.

هەروەک لە ڕێگەی تۆزوخۆڵ و غوبارەوە، بڕێکی زۆر ماددەی ژینگەپیسکەرو هۆکاری نەخۆشی بۆ ناوچەیەکی فراوان دەگوازرێتەوە. ئێستاش هەندێك لە زیانەکانی تۆزو خۆڵ دەخەینەڕوو کە بریتین لە:

- کێلگەو دارودرەختەکان تێك دەدات.
- جوڵەو هاتووچۆی زەمینی و ئاسمانی پەکدەخات.
- دەبێتە هۆی گواستنەوەی زۆر جۆری نەخۆشی.

چۆن خۆمان بپارێزین لە زریانە لماوییەکان؟

- لەکاتی هەڵکردنی زریانی لماوییدا، ئەگەر زۆر پێویست نەبێت مەچۆرە دەرەوە، ئەگەریش ناچاربوویت بچیتە دەرەوە، ئەوا دەمامکی تایبەت بەکاربهێنە.
- پێویستە ئەوانەی نەخۆشی هەناسەتەنگی و هەستیارییان هەیە، ئەگەر ناچاری چوونەدەرەوە بوون، ئەوا دەبێت داوودەرمانەکانیان بە باشی بەکاربهێنن.
-داخستنی دەرگاو پەنجەرەکانی ماڵەوە بە باشی.
- بەکارهێنانی چاویلکەی بەرخۆر بۆ پاراستنی چاو لە تۆزو خۆڵەوە.
- دەبێت گەورەکانمان لە کاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلدا وریاو ئاگاداربن.
- دەبێت دەوڵەت هەستێت بە زیادکردنی ڕووبەرەکانی سەوزایی و چاندنی دارودرەختێکی زۆر لە دەوروبەری شارەکاندا، چونکە ئەمانە دەبنە بەربەستێك لە بەردەمی تۆزو خۆڵی زریانەکاندا.

سەرچاوە: گۆڤاری (العربی الصغیر) ژمارە ٢١٤ -٢٠١٠

# لێکۆڵینەوەی زانستی

وەهاب حەسیب محەممەد

پارساڵ جیهان ڕووبەڕووی کێشەیەکی ئابوری بێ وێنە بووەوە، ئەنجامە بەراییەکانی بریتی بوو لە داڕمانێکی تەواوی سەروکاری دارایی‌و ئابوری‌و کۆمەڵایەتی بنیاتنراو لە وڵاتە سەرمایەدارە پێشکەوتووەکاندا.

ئەنجامەکەشی بە شێوەیەکی نێگەتیف بەسەر زۆرێك لە وڵاتانی دنیادا شکایەوە، [ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش بەدەرنەبوو لەو کاریگەرە نەرێیانە] ئاریشەکە بە زەمینی لەرزەی ئابوری جیهان ناسێندرا، کە ئەنجامی ئیفرازاتی جیهانگیری‌و بازرگانی ئازادو کێبەرکێی وڵاتانو باڵا دەستی کۆمپانیا زەبەلاحەکان بوو بەسەر ئابوری گێتیدا.

بە داخەوە لە چەند دەیەی ڕابردوودا وڵاتە سەرمایەدارەکان دیدو بۆچوونەکانی تایبەت بە خۆیان لە مەڕ دارایی‌و ئابوری...هتد، بە سەر وڵاتانی هەژارو تازە گەشەکردووەکاندا سەپاند، بەدەر لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندی‌و بەرژەوەندی میللی ئەو وڵاتانە، ئەنجامەکەشی بریتی بوو لە: (بێبازاڕی، پەشێوی ئابوری، جێگیرنەبوونی دارایی وڵاتانی هەژارو کەمدەست، زۆربوونی بێکاریی‌و بڵاوبوونەوەی جۆرەها پەتاو نەخۆشی‌و کارەساتی ژینگەیی). جەمبوونی ئەم ئاریشانەش هەر یەك بە جۆرێك هەڕەشە لە ئاسایشی کۆمەڵایەتی‌و جێگیرنەبوونی ئابوری‌و ئاسایشی میللی ئەو وڵاتانە دەکەن.

لێرەوە گرنگی لێکۆڵینەوەی زانستی هەستی پێ دەکرێت لە مەڕ بەرەنگاربوونەوەی کێشە زۆرو لە بن نەهاتووەکانی ژیانی ڕۆژانەی ئادەمیزاد.

ڕۆڵی زاناو شارەزایان لەو مەیدانەداو دوورکەوتنەوە لە ئەو تەماشاکردنو تێڕوانینانەی لەگەڵ تایبەتمەندی‌و ژینگەی خۆیاندا نا تەباو چوون یەکنین، تەماشا نەکردنی زێدو پێداویستییەکانیان بە چاویلکەی خەڵکانی تر، ئەم کارەش دەخوازێت بە دابینکردنی: کەسانی پسپۆڕو شارەزا، ژینگەی لەبار، دابنیکردنی بودجەی گونجاو کە شایانی تەواو کردنی ئەو کێشانە بێت. هاوکات پێویستە لێکۆڵەرانو دانایانی بواری لێکۆڵینەوەی زانستی خۆیان بە دووربگرن لەو هەڵنانو سەرچاوانەی وڵاتانی تر کە سەپێندراوە بەسەریانا، یاخود وەك دوا ڕاستی‌و کۆتا سەرچاوە فەرزکراوە بە سەریاندا، چونکە جێبەجێکردنی ئەو بۆچوونانە چاوگەی ئەو نەهامەتییانە بوو کە بەسەر دارایی، ئابوری، ژینگەی جیهانیدا هێنا.

کێشەکان هەنوکە بەردەوامن، دەرهاوێشتەکانی هەر ڕۆژە وەك کوانولە لە جێگایەك سەردەردێنێ، دوایین چەڵەمە ئاریشەی دارایی وڵاتی یۆنانە، بۆیە لێکۆڵینەوە زانستییەکان لەم وڵاتانەدا پێویستە هەڵقوڵاوی زێدی خۆیان بن، بە هیچ شێوەیەك کۆپی شوێنو دیدگای کەسانی دی نەبن. گرنگترین ئەو کارانەی لەم وڵاتانەدا ڕووبەڕووی لێکۆڵینەوەی زانستی دەبێتەوە، یان دەخوازێت لە پێشەنگی شولی ویدا بێت ئەمانەن:

نەخوێندەواری، چاککردنی پەروەردە، هەژاری، بێکاری، گەشەی ئابوری‌و پەرەپێدانی کشتوکاڵ، دابینکردنی خۆراك‌و بە فیرۆنەدانی سامانی نەتەوایەتی، مافی مرۆڤو کۆمەڵگای مەدەنی، گەندەڵی کارگێڕی‌و شەفافییەتی بەڕێوەبردنو دادگەری کۆمەڵایەتی، سەلامەتی هاتووچۆ، ئابوری مەعریفی‌و دەوڵەتی دامەزراوەیی... هتد.

کارێکی بەڵگەنەویستە ئەو بودجەیەی لە لێکۆڵینەوەی زانستیدا خەرج دەکرێت چەند بەرامبەر داهاتی دەبێت بە نموونە: لێکۆڵینەوەکان سەلماندویانە لە ماوەی (٤٥) ساڵی ڕابردوودا ئەو خەرجییانەی لە بواری کشتوکاڵدا لە وڵاتێکی وەکو ئەمریکادا سەرفکراوە لە (٧٠٠٪) قازانجی هەبووە، یەکێك لە لێکۆڵەرەوان دەبێژێت ئەو ئەلەمنیۆمەی دێتە کرین لە وڵاتی بەحرەین لە لایەن یابانەوە نرخی یەك تەن (٨٠٠$)ە پاش پوختەکردن و دروستکردنی جۆرەها پێداویستی هەناردەی وڵاتانی دەرەوە دەکرێت بۆ هەر یەك تەن یابان لەم کارەدا (١٠٠٠٠٠ $) داهاتی دەبێت، بۆیە وڵاتانی پێشکەوتوو بەشێکی باش لە بودجەی ساڵانەیان لەو بوارەدا تەرخان دەکەن، ئەوەتا ئەمریکا لە ٢،٦٩٪و یابان لە ٢،٥٨٪ وڵاتانی دیکەش هەریەك بەشێوەیەك، [ئەم ڕێژانە ساڵانە هەڵدەکشێتو جێگیر نییە بێگومان بە گوێرەی بودجەی ساڵانەی ئەو وڵاتانە]، چونکە ئەو دراوەی لە لێکۆڵینەوەی زانستیدا خەرجدەکرێت چەندین جار دەسکەوتی دەبێت، هاوکات هۆکارێکی دڵنیاکەرەوەی بوژانەوەی ئابورییە، دوور لە لێکۆڵینەوەی زانستی ئەوەی بە دەست هێنراوە هەمیشە لە بەردەمی ڕەحمەتی فەنا بووندایە. بەڵام لە وڵاتانی عەرەبیدا لە ٠،٣١٪ بودجەی ساڵانە بۆ ئەو شولە مەزنە دێتە جێکرن (بە گوێرەی کەناڵی

ئاسمانی (الحریە) لە چاوپێکەوتنی لەگەڵ بەرپرسێکی وەزارەتی خوێندنی باڵادا ئەو گوتی لە بودجەی ساڵی ٢٠١٠ی حکومەتی فیدراڵی عێراقدا پشکێك نییە بە ناوی لێکۆڵینەوەی زانستی)!!

## مانای زانیاری لێکۆڵینەوەی زانستی چییە؟

زانیاری لە ژیانی ڕۆژانەدا هۆکارێکە ئادەمیزاد بەهۆیەوە دەکرێت زاڵبێت بەسەر ئاریشەکاندا، نەخشەی داهاتوی پێ دیاری دەکات، دکرێت بە دووربێت لە هەڵە. زانیاری بە گشتی دووجۆرە: زانیاری گشتی و تایبەتی. زانینی گشتی ئەوجۆرە سەرلێدەرکردنەیە: مرۆڤەکان لە چالاکی ژیانی ڕۆژانەدا بە دەستی دەخەن وەکو کڕین و فرۆشتن.

زانینی تایبەتی کە زانیارییەکی وردەو پشت نابەستێت بە تەماشاکردن و تاقیکردنەوەی ژیانی ڕۆژانە، بەڵکو بە دەستدەخرێت بە هۆی فێربوون و شیکردنەوەی بابەتیانەوە.

لێکۆڵینەوەی زانستی چییە؟

ڕێکخراوی یونسکۆ بەم شێوەیە لێکۆڵینەوەی زانستی دەناسێنێت: چالاکییەکی لێکۆڵینەوەییە ئاڕاستە دەکرێت رووەو زیادکرنو بە دەستهێنانی زانست، یان دۆزینەوەی بواری زانستی پێشکەوتوو، بە ئامانجی جێبەجێکردنی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ.

کەسانێکی دیکە بەم شێوەیە پێناسەی دەکەن بریتییە: لە شێوازی گەیشتن بە ڕاستییەکان لە بواری بە دەرخستنی زانیاریدا بە هۆی کۆمەڵێك ڕێسای گشتی بە هیوای گەیشتن بە ئەنجامی دیارو ئاشکرا.

هەرچەند ناساندنەکان جیاوازبن، بەڵام لە کۆمەڵێك لایەنی هاوبەشدا یەکانگیر دەبنەوە کە بریتییە لە: بیرکردنەوەی ڕێکخراو کە پشت ئەستورە بە تێبینی زانستیو بە دەستخستنی داتاو ڕاستییەکان، ئامانجی شیکردنەوەی دیاردە کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکانو.... هتد، دوور لە خواستو ئارەزویی تایبەتی، بە شێوەیەك توانای گشتاندنو ئەندازەگیری هەبێت بەسەر کێشەو دیاردە جیاوازەکاندا.

لێکۆڵەری زانستی کێیەو تایبەتمەندییەکانی چین؟

لێکۆڵەرەوەی زانستی واناسراوە کە: کەسی نەخشە داڕێژەرو ڕێکخەرو جێبەجێکارو ئاڕاستەکاری لێکۆڵینەوەی زانستییە لە هەموو قۆناغەکانی لێکۆڵینەوەی زانستیدا. تا گەیشتن بە ئەنجامێکی زانستیو مەنتیقی (ژیربێژی).

لێرەدا بۆ ئەوەی بابەتەکە پوختتر بێت پێویستە لە سەر دووخاڵ هەڵوەستە بکەین:

یەکەم- ئامادەکردنی لێکۆڵەری زانستی: لێکۆڵەری زانستی خاوەن پیشەیە وەك هەر پیشەیەکی دی، بە نموونەی (دکتۆر، ئەندازیار، پارێزەر....) ئامادەکردنی پێویست بە ئامادەکارییەکی تایبەت دەکات لە چوارچێوەی بەرنامەیەکی ئەکادیمیدا بە ئامانجی پێگەیاندنی کەسی لێکۆڵەر سەرەڕای ڕامهێنانی بە شێوەیەکی پراکتیکی بە هیوای ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەی زانستی، ئەم سازکردنە پێویستی بە بڕینی چەندین قۆناغی زانستی هەیە لە خوێندنی زانکۆ تا دەگات بە تەواوکردنی خوێندنی باڵا.

ئەم هەنگاوانە لە بەرنامەڕێژی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە دەست پێ دەکاتو بە بەکاربردنی کۆمپیوتەرو ئینتەرنێتو ئامار بۆ تەواوکردنی لێکۆڵینەوەی زانستی دوایی دێت.

دووەم تایبەتمەندی کەسایەتی لێکۆڵەری زانستی:

١- ئەندێشەو ڕەسەنایەتی دوو ڕەگەزن ناکرێت دەستبەرداریان بیت لە بواری داهێنانی زانستیدا.

٢- کۆڵنەدان. ٣- خۆشەویستی زانستو خۆبەکەمزانین. ٤- پێویستە لێکۆڵەر ئاسۆی بیرکردنەوەی فراوان بێت.

٥- توانای ڕەخنەگرتنی هەبێت (دەرخستنی خەوشی هزرو کردەوە).

٦-بوونی گومان لەو زانیارییانەی کاریان لەسەر دەکاتو لەو هەنگاوانەی هەڵیان دەنێت بە هیوای یەکلایبوونەوەی ڕاستییەکان.

٧- بێلایەنی.

٨- (ئاکاربەرزی) ئەم سیفەتە ڕەنگدەداتەوە لە بێلایەنی فکریو وەرگرتنی زانیاری لە سەرچاوەو کەسانی کە بە ئەمانەتو هێرش نەکردنە سەر شارەزایانی تر ئەگەر بە وشەیەکیش بێت.

٩- دانایی.

## تایبەتمەندییەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی

١- بابەتیانە: لێکۆڵینەوەی زانستی پێویستە دووربێت لە ئارەزووی خودی لێکۆڵەر، دەبێت ئامانجی چوونە ناو دنیای ڕاستیو بەدیهێنانی حەقیقەت بێت، شایەد لەگەڵ ئارەزوویدا وێك نەهاتەوە.

٢- دووبارە بوونەوەو گشتاندن: واتە هەرکاتێك لێکۆڵەرێکی دیکە هەستا بە لێکۆڵینەوەی هەمان (لێکۆڵینەوە) هەمان شێوازی زانستی بەکارهێنا، لە هەمان باردۆخو مەرجی بابەتیانەدا ئەوا هەمان ئەنجامی دەبێت.

٣- گردکرنەوەی زانیاری: لێکۆڵەر سوود لە کەسانی بەر لە خۆی وەربگرێت، هەنگاوەڕاستەکانیان تەواو بکات بە هیوای فراوانکردنی چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکەی گەیشتن بەو ئەنجامانەی کەسانی دی پەیان پێنەبردووە، زانین کردارێکی جەم بوونە بەشێوەیەکی ئاسۆیی.

٤- گەڕان بە دوای هۆکارەکاندا: زانینی هۆکارەکان ئامانجێکی تیۆریو پراکتیکی هەیە، ئامانجی سەرەکی زانست تێگەیشتنە لە دیاردەکان بە یارمەتی هۆکارەکان.

٥- دڵنیایی: مەبەست پشت بەستنە بە ڕاستی زانستی بینا لەسەر کۆمەڵێك بەڵگەی بابەتیانەی قەناعەتکار.

چەندین تایبەتمەندی تریش هەن وەك: ڕێکخستنو وردەکاری.... هتد.

## گرنگی لێکۆڵینەوەی زانستی لە چیدایە؟

لە دنیای ئەمڕۆدا گرنگی وڵاتانو تەنانەت تاکی کۆمەڵگاش بە بڕی ئەو زانیارییانە دیاری دەکرێت کە توانیویەتی بە دەستیان بهێنێت، پارێزگاریان لێ بکات، (ئەم کارانە لە ئەنجامی کۆششو هەوڵی لێکۆڵینەوەی زانیاری گیردەکەون)، کەواتە ئێمەی میللەتی کورد لە کوێی ئەم جیهانە فراوانەداین کوا ئەنجامی ئەو لێکۆڵنەوانەی زانکۆو پەیمانگاکان وەك چارەسەری گرفتە زۆروزەوەندەکانی هەرێمی کوردستان خستویانەتە بەرچاوی ناوەندەکانی بڕیاردان، بە نموونە وڵاتی سوید ڕۆژانە لە.توانایدا هەیە سەرژمێری دانیشتووان بکات، چونکە هەر ٣ کاتژمێر جارێك تۆماری لە دایکبووانو کۆچکردووان دەنوسرێت، هەمان کار لە وڵاتێکی وەك میسردا (٣) ساڵی دەوێت، چونکە ئەو ڕوونکردنەوانەی لایەنی فەرمی بڵاوی دەکاتەوە ناوەرۆکی لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دی جیاوازە، ئەمەش وا دەکات بەراورد لە نێوانیاندا ورد نەبێت.

یان کاتێك وڵاتی چین جەنگی (ئەفیون)ی دۆڕاند بەرامبەر بە بەریتانیا، بە هەموو لایەنێکی شارستانییەتەکەیاندا چوونەوە، پێیان وابوو خەوشێك لە ڕابردوویان هەیە ئەمان هەستیا پێ نەکردووە، چونکە خۆ وڵاتی چین گەلەك بە ڕابردوویان شانازی دەکەن هەموو ئەم مەتەڵانە وەڵامەکەیان بە لێکۆڵینەوەی زانستی بە دی دێت. کاتی ئەوە هاتووە ناوەندەکانی بڕیاردان لە هەرێمی کوردستان ناوەندو دەزگاکانیان چالاك بکەن، تا لە توانایاندا هەبێت چارەسەری ئاریشەکان پیشانی گشت لایەك بدەن.

# ناسینەوەی بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکاندا

بەشی یەکەم

ئیبراهیم مستەفا خدر

لە ماوەی دوو دەیەی ڕابردوودا گۆڕانکارییەکی بەرچاو لە سروشتی کارو شوێنە پیشەییەکان لە گۆڕەپانی جیهانی ڕووی داوە کە شوێنەوارێکی قوڵی لەسەر هەموو لایەنەکانی بە جێهێشتووە لە کارو چالاکییەکانی کۆمپانیاو نووسینگە ئابوورییەکان. نموونەی ئەو گۆڕانکارییانە دەتوانرێت ئاماژە بە زیادبوونی ڕکابەری لە تەواوی بەشەکانی خزمەتگوزاریو بەرهەمهێنانو گرنگیدان بە ئارەزووی کڕیارەکان بکرێت.

ئەمڕۆ زۆربەی کۆمپانیاکان لەسەر پەیوەندی کردن لەگەڵ کڕیارو ڕاکێشانی کڕیاری نوێ ڕکابەری یەکتر دەکەن تاکو وەفاداری کڕیار لە ماوەیەکی درێژخایەن بۆ ڕێکخراو مسۆگەر بکەن. هەندێ لە کۆمپانیاکان بە شێوەیەکی سوودمەند ڕکابەری یەکتر دەکەنو ئەو ڕکابەرییە لە ڕێگای بنەماکانی کارگێڕیو پەیوەندی بازاڕسازی بە سوود وەرگرتن لە بەکارهێنانی بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیار (Customer Relationship Mmanagement) بەدەست دێت.

بە کارهێنانی تەکنەلۆژیای بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان، ئەرکی پیاوانی ڕامیاریو پێکهێنەرانی ڕێکخراوە، هەروەك (فرۆشتن، بازاڕسازی، خزمەتگەیاندن بە کڕیار)و هۆکارەکانی ڕێو شوێنو لاوەکی ناو ڕێکخراویش وەك (دارایی‌و هەنگاوەکانی پێویست بۆ دەستەبەرکردنو دابەشکردنی سەرچاوە مرۆییەکان) لەگەڵ خاڵە پەیوەندیدارەکانی کڕیاری کۆمپانیا ڕێکدەخات، لە ڕێگای (ئینتەرنێت، پۆستی ئەلیکترۆنی، کردارەکانی کڕینو فرۆشتن، بازاڕسازی تەلەفۆنی، ڕیکلام، فاکس... هتد)بێت، کە زۆربەیان بە سیستەمەکانی زانیاری تایبەتو سەربەخۆ کۆنترۆڵو چاودێری دەکرێت، بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان خاڵەکانی پەیوەندی سەبارەت بەو گۆشەنیگایە بە یەکەوە کۆدەکاتەوە.

بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان یارمەتی ڕێکخراو دەدات کە وەڵامی زۆربەی پرسیارەکان بدۆزێتەوە. بۆ نموونە، ئەوەی کە چ بەرهەمو خزمەتگوزارییەك بۆ کڕیارەکان گرنگە؟ چۆن دەبێ پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان دروست بکرێت؟ چ جۆرە ڕەنگو مۆدێلێك لە لایەن کڕیارەکانەوە پەسەند دەکرێت؟.هتد.

بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان لە چاو ڕێکخراو دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی کڕیارەکان، دەست پێوەگرتن بە خەرجییەکانو دەستکەوتنی قازانجی زیاتر، کەواتە دانانو دامەزراندنی بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان یەکێکە لەو بابەتە گرنگانە کە لە دونیای ڕکابەری ئەمڕۆ بە هۆکاری مانەوەی ڕێکخراوەکان دادەنرێتو تەکنەلۆژیای نوێو بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان هەنگاوەکانی کارکردنو پیشەیی‌و هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کڕیارەکان ڕێکدەخاتەوەو ئەم کارە دەبێتە هۆی وەفاداربوونی کڕیارەکان لەگەڵ بەرەبەرە زیاترکردنی قازانجو سوودمەندی ڕێکخراو.

هەرچی سەبارەت بە هەنگاوەکانی تەواوکەریو پێگەیشتنی سیستەمەکانی بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان دەتوانرێ لە سێ گروپدا پۆلێن بکرێت:-

١- دەیەی ١٩٨٠: دەیەی بازاڕسازی بە پێی بنەماکانی بانکی زانیاری کڕیارەکان بوو، ئامانجی ئەو سیستەمە پاراستنو پارێزگاری کردن بووە لە ئەژمێرەکانی کڕیارەکان، ئەو زانیارییانە کە لەو سیستەمە پارێزگاری دەکرا بریتی بوو لە کردارو ڕێژەی کڕین لە لایەن کڕیارەکان، بەڵام ئەو سیستەمە ڕەخنەیەکی زۆر ئاراستەی کرا، چونکە تەواوکردنو کۆکردنەوەی تەواوی زانیارییەکان سەختو دژواربوو.

٢- دەیەی ١٩٩٠: دەیەی جەختکردن لەسەر وەفاداری کڕیارەکانو ئامانجی ئەو سیستەمە وەفاداری کڕیار بەرامبەر بە ڕێکخراوو گرەنتی کڕینی نوێ لە نوسینگە ئابوورییەکان لە لایەن هەمان کڕیارو کەمکردنەوەی نارەزایەتی کڕیارەکان، خستنەڕووی نرخی پێشنیارکراوەکانو بەرهەمە جیاوازەکان بە کڕیارەکان بوو.

٣- دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم: کە بە دەیەی بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکانەوە ناو دەبرێت.

# یەك كیلۆ = 900 گرام

جوتیارێـك لە گوندێكی نزیك شـاردا لەگەڵ خێزانو منداڵەكانی ژیانێكی خۆشو ئاسـوودەو پڕ كامەرانیان دەگوزەراند، ئەم جوتیارە جگە لە كاروباری كشتیاریو زەویو زار، هەندێك مەڕومالآتیشی هەبوو، ڕۆژانە لە بەرهەمەكانی مەڕومالآتەكەی سـوودی وەردەگـرت، خاتوونـی خێزانـی چەندەها بەرهەمی لە شیری مەڕەكان دروست دەكرد، وەكـو پەنیر، لـۆرك، دۆ، كـەرە... خاڵەی جووتیـار هەفتانە بەرهەمەكـەی دەبردە بازاڕو بە پارەكەی پێداویستییەكانی ژیانی ڕۆژانەی وەكـو برنجو شـەكرو...هتد، پێ دەكڕی، ڕۆژێكیان خاڵەی جووتیار چوو بۆ شار بۆ فرۆشتنی ئەو بەرهەمانەی خاتوونی خێزانی دروستی كردبوو، خاتوونیش وەكو نەریتی هەمیشەیی پەنیرەكانی لە شێوەی تۆپێكی خڕی گەورەدا دروست دەكرد، كێشی هەر پارچە پەنیرێك یـەك كیلۆگرام بوو، جووتیارەكە گەیشـتە دووكانی فرۆشیاری شیرەمەنییەكەو بەرهەمەكانی پێ فرۆشت، پێداویسـتییەكانی وەكو ڕۆنو شەكرو چای لە هەمان دوكان كڕی، پاشـان گەڕایەوە بۆ گونـد، پاش ئـەوەی جووتیارەكە دووكانی فرۆشـیارەكەی جێهێشـت، دوكاندارەكـە دەستی كرد بەڕیزكردنی پارچە پەنیرەكان لە نێو بەفرگرەكەیدا، لە ناكاو بە خەیاڵیدا هات یەكێك لە پارچە پەنیرەكان بكێشێت تـا دڵنیا بێت لەوەی كە هەر پارچەیەكیان كێشـی یەك كیلۆگرامـە، كاتێك یەكێك لە پارچـە پەنیرەكانـی كێشـا، بینی كێشـی تەنهـا ٩٠٠ گرامـە، دوكاندارەكـە سـەری سـوڕما، چونكە كابـرای جووتیار پیاوێكی سەر ڕاسـتو بێ فڕوفێڵ بوو، پارچەیەكی دیكەی كێشـا، ئەویش هـەر ٩٠٠ گرام بوو، هەمـوو پارچەكانی دیكەی كێشـا، ئەوەی جێگەی سەرسـوڕمان بوو ئەوەبوو هەموو پارچـە پەنیرەكان كێشـیان ٩٠٠ گرام بوو، لەوانەیە منو تۆش وەكو كابرای دووكاندار وا هەسـت بكەین خاڵەی جووتیار فێڵی لە دووكاندارەكە كردووەو پەنیرەكانی بچووك دروسـتكردووە تا پارەی زیاتر دەستبخات، بـەڵام گـەر پەلـە نەكەیـن دەزانین كێ فێڵبازەو كێش سەر ڕاست؟!

بۆ هەفتـەی ئایندە جووتیارەكە وەكو نەریتـی خۆی بەرهەمەكانـی كۆكردەوەو بەرەو شـار بـە ڕێ كـەوت، ڕۆیشـتەوە بـۆ هەمـان دووكانو بە دڵێكـی پاكەوە بەرهەمەكانـی خسـتە بەردەمـی، بەڵام دووكاندارەكـە بە دەنگێكـی بەرز هاواری كرد بە سـەریداو وتی: جارێكی دیكە من مامەڵە لەگـەڵ تۆدا ناكەم، تـۆ پیاوێكی فێڵبازو دەسـتبڕیت، هەمـوو ئەو پارچە پەنیرانەی جاری پێشـوو پێت فرۆشتووم كێشـیان ٩٠٠ گـرام بووە، تۆ یـەك كیلۆ گرامی تەواوت لەسەر من حساب كردووە!

خاڵـەی جووتیـار بـە بیسـتنی ئەم هەواڵە تەزوویەك لێیدا لە نووكی پێیەوە تا تەوقی سـەری، زۆر سـەری سوڕما، بە ئارامییـەوە وەڵامـی دایـەوەو وتی: برام گومانـی خـراپ بە ئێمـە مەبـە، ئێمە خەڵكانێكـی هەژاریـن، هیـچ كات فێڵ و تەڵەكەمـان نەكـردووەو نایكەیـن، نانی حەرامـمان دەرخـواردی منداڵەكانمـان نـەداوەو بـە فێڵو تەڵەكە پارەو سـامان كۆناكەینەوە، ئێمە كەسانێكین بە ئارەقی نێوچـەوانو دەسـتو بـازوو نـان پەیدا دەكەیـن، ئیـدی بـۆ دەبێت فێـڵ لە تۆ بكەین؟! لەم قسـانەدا بوو بە بیریدا هات كە بۆچی كێشـی پەنیرەكان بەو شێوەیە، بۆیە ڕووی كردە دووكاندارەكەو پێی وت: ببورە ئێستا دەزانم هۆی چییە پەنیرەكان كێشیان تەنها ٩٠٠ گرامە!

پرسی: بۆچی؟

خاڵەی جووتیار وتی: چونكە ئێمە لە گوندەكەی خۆمان كیلۆی ئاسنمان لا نییە، ئەگەر بمانەوێت شتێك بكێشین ئەو كیلۆ شەكرەی تۆ بە حسابی كیلۆیەك دەیدەیت بە من، دەیخەینە سەر لایەكی تەرازووەكەو پەنیرەكـەش دەخەینە سـەر لاكەی تری، بەو شێوەیە پەنیرەكە دەكێشین!

كاكی دووكاندار، ئێسـتا دەزانیت ئێمە دەستبڕو فێڵباز نین؟

هەروەهـا دەزانیـت بۆچـی كێشـی پەنیرەكان تەنها ٩٠٠ گرامە؟

# قازی ئەبو یوسف!

ن: بەرزان ئەبوبەکر

قازی ئەبو یوسف هەر لە تەمەنی منداڵیدا باوکی ماڵئاوایی یەکجاری لێکردو دنیای بەجێهێشت، قازی ئەبو یوسفو دایکی جگە لە خەموپەژارەی ئەو کارەساتە، بارودۆخی ژیانو لێپرسراوێتی ماڵیشیان کەوتە ئەستۆ، دایکی لە پێناوی پەیداکردنی بژێوی ڕۆژانەیاندا، هەوڵیدا کوڕەکەی فێری پیشەیەك بکات، تا ئاتاجی دەستی کەس نەبن و نەبنە ئەرك بۆ سەرشانی هیچ کەس، بۆ ئەم مەبەستە کوڕەکەی نارده لای وەستایەکی بەرگدروو، تا فێری دروومان ببێتو ڕۆژانەش چەند درهەمێك پەیدا بکات، بۆ بەڕێوەبردنی ژیانو گوزەرانیان.

ئیدی لەو ڕۆژە بە دواوە قازی ئەبو یوسف هەموو بەیانییەك زوو دەچووە دووکانی بەرگدرووەکەو کاری لەگەڵدا دەکرد، ئێوارانیش تەنها یەك درهەمی شاگردانە وەردەگرت، ئەویش پارەکەی دەبردەوە بۆ دایکی تا خۆراكو پێداویستییەکانی ڕۆژانەیانی پێ بکڕێت.

چەند ڕۆژێك قازی ئەبو یوسف چووە لای بەرگدرووەکە، بەڵام قەدەر وابوو ڕۆژێکیان ڕێی کەوتە مزگەوتێك، بینی کۆمەڵێك قوتابی لە دەوری پێشەوا ئەبوحەنیفە کۆبوونەتەوەو سەرقاڵی موتاڵاکردنو خوێندنن، لێیان نزیك بووەوەو کەمێك گوێی بۆ قسەکانی مامۆستا ڕادێرا، بە وتەکانی زۆر سەرسام بوو، هەر بۆیە لە کۆڕەکەیاندا دانیشتو بڕیاری دا ئەو ڕۆژە نەچێتە لای بەرگدرووەکە، بۆ ڕۆژی دواتریش بە هەمان شێوە چووەوە بۆ لای پێشەوا ئەبوحەنیفەو ئامادەی وانەکانی بوو، بەرگدرووەکەش ئێوارە چوو بۆ ماڵی قازی ئەبو یوسفو سکاڵای نەهاتنی لای دایکی کردو پێی گوت: ئەوە دوو ڕۆژە کوڕەکەت نەهاتووە بۆ سەر کار، لەبەرئەوە منیش ڕۆژانەکەی دەبڕمو ئیدی چاوەڕێی کرێی کاری کوڕەکەت مەکە، بۆ ڕۆژی دواتر دایکی چوو بە شوێن کوڕەکەیدا تا بزانێت بۆ کوێ دەچێت، وا دوو ڕۆژە نەچووەتە سەرکار، بینی لە کۆڕی قوتابییەکانی پێشەوا ئەبوحەنیفەدا دانیشتووە، بە توورەییەوە دەستی گرتو مۆڵەتی لە مامۆستا خواست تا بیباتە دەرەوە!

پێشەوا ئەبوحەنیفە پێی گوت: دادەگیان من زیرەکییەکی بێ وێنە لە منداڵەکەتدا بەدی دەکەم، تکایە مۆڵەتی بدە با بخوێنێت، دڵنیابە ڕۆژێك بە سەر کوڕەکەتدا دادێت خواردنی (فالوزەج) دەبێت، (فالوزەج جۆرێك بوو لە شیرینی لە ڕۆنی فستەق دروست دەکرا، لەو زەمانەدا جگە لە خەلیفە کەس لە توانایدا نەبووە ئەو جۆرە خواردنە بخوات)!

دایکی قازی ئەبو یوسف وەڵامی دایەوەو وتی: مامۆستا گیان تۆ بێ ئاگای لە حاڵی ئێمە، تکایە واز لە کوڕەکەم بهێنە، تەنها ئەم کوڕەمان هەیە ڕۆژانە درهەمێکمان بۆ پەیدا بکات.

بۆ ڕۆژی دواتر قازی ئەبو یوسف دووبارە ڕۆیشتەوە بۆ لای پێشەوا ئەبوحەنیفەو نە ڕۆیشت بۆ لای بەرگدرووەکە، پێشەوا زۆر حەزی دەکرد قازی ئەبو یوسف بەردەوام بێت لە خوێندن، چونکە قوتابییەکی زۆر ژیرو زیرەكو لێهاتوو بوو، بە داهاتووی زۆر گەشبین بوو، هەربۆیە لێی پرسی: کوڕی شیرینم، بەرگدرووەکە ڕۆژانە چەند درهەمت پێ دەدات؟

قازی ئەبو یوسف وتی: تەنها یەك درهەم.

پێشەوا وتی: من هەموو ڕۆژێك ٣٠ درهەمت پێ دەدەم، تا دایکت ڕازی بێت تۆ واز لە کارکردن بێنیتو درێژە بە خوێندن بدەیت. (پێشەوا ئەبوحەنیفە جگە لەوەی زانایەکی ناودارو بلیمەت بوو، لە هەمان کاتدا بازرگانێکی دەوڵەمەندو بەخشندە بوو)!

دایکیشی بەمجۆرە ڕازیبوو، کوڕەکەی لای پێشەوا ئەبو حەنیفە بخوێنێت.

ڕۆژان تێپەڕیو قازی ئەبو یوسف

خوێندنی تەواو کردو بووە زانایەکی بە ناوبانگی سەردەمی خەلیفە هارونە ڕەشیدو پۆستی قازی پێ درا!

پاشان لەبەر لێهاتوویی قازی ئەبویوسف هارونە ڕەشید پۆستی سەرۆکی دادوەرانی پێبەخشی!

جارێکیان قازی ئەبویوسف لەگەڵ هارونە ڕەشید پێکەوە لە سەر خوانێك دانیشتبوون، خواردن گەلێکی نایابو خۆش لەسەر خوانەکە دانرابوو، یەکێك لەو خواردنانە (فالوزەج) بوو، کە بە ڕۆنی فستەق دروستکرابوو، قازی ئەبویوسف کاتێك سەیری فالوزەجەکەی کرد، هۆن هۆن فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە. خەلیفە پرسی: چی ڕوویداوە، بۆچی دەگریت؟

قازی ئەبو یوسف تەواوی چیرۆکەکەی بۆ هارونە ڕەشید گێڕایەوە!

خەلیفەش وتی: ڕەحمەتی خودا لە پێشەوا ئەبوحەنیفە بێت، کە بە چاوی عەقڵی سەیری داهاتووی تۆی کردووە، نەك بە چاوی سەری! بەڕاستی هەر زانستە پلەوپایەی خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا بەرز دەکاتەوە!

پاشان قازی ئەبو یوسف وتی: ئەگەر ئەو کارەم بکردایە کە دایکم دەیویست، ئەوا ئێستا بەرگدروویەك دەبووم، بەڵام خودا ویستی من ببمە زانایەكو لەگەڵ خەلیفەو ناوداراندا دابنیشمو لەسەر خوانی ئەوان نانبخۆم!

دایکی ئازیز، باوکی بەڕێز: تکایە بە چاوی سەرتان سەیری داهاتووی منداڵەکانتان مەکەن، بەڵکو بە چاوی عەقڵتان بۆ داهاتوویان بڕوانن..

ڕەنگە ئەمڕۆ منداڵەکانت بتوانن چەند دینارێکتان بۆ پەیدا بکەن، بەڵام دڵنیابن ئایندەیان وێران دەبێت!

لەوانەیە ئەمڕۆ کە پارەی شاگردانەکەی وەردەگرێت، خۆشحاڵ ببیو پێ بکەنێت، بەڵام سەرەنجام دەبێت هەموو تەمەنی نیگەران بیو فرمێسك بۆ ڕابردووی لە دەستچووی هەڵوەرێنێت! هەمووشمان دەزانین ئەو کات پەشیمانی دادمان نادات!

کەواتە ئێستا هانی منداڵەکەت بدە لەسەر فێربوونو زانستو زانیاری، کەشی خوێندنی بۆ فەراهەم بهێنە، چونکە هەر زانستە ئایندەی مرۆڤەکان گەشو ڕوون دەکاتو دەبێتە هۆکاری بەختەوەری دنیاو دواڕۆژیان..

ماڵوسامان لەناو دەچێت، بەڵام هەرگیز زانستو زانیاری لەناو ناچێت!

و: دانا محەمەد هەڵەبجەیی

# چین ئاواتەکانتان؟

دەربارەی ئەو شتانەی کە لە ژیاندا دەتانەوێت بە دەستی بهێنن بە وردی بیربکەنەوە، هەر یەکە لە لایەنە جیاوازەکانی ژیانی خۆت لەبەرچاو بگرە، لەو شتە وردبەرەوە کە دەتەوێت بەدەستی بهێنییت نەك ئەو شتەی کە ناتەوێت، لەگەڵ ڕاستی دەروونی خۆت، ئاواتە ڕاستەقینەکان، ئامانجەکان، پەیوەندی دروست بکە بە بێ ترس، شەرم، یان ڕێگری، ڕێزیان لێبنێ، ببە بە خاوەنیان ئاواتو ئەندێشەکان تەنها موڵکی تۆن، بەڵام دەبێت دیارییان بکەیت تا بە دەستیان بهێنێت.

ئێوە شایانی ئەوەن ئەو شتانەی بەڕاستی لە ژیاندا دەتانەوێت خاوەنی بن، هەموو ئاواتەکانتان ئەگەر گرنگ بن بە لاتانەوە، جیاوازی نییە ئەگەر داواکاری ئێوە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی، ئۆتۆمبێلێکی نوێ، لێهاتووییەکی بێ وێنە، گەشتێك بۆ دەرەوەی وڵات، یان سەرکەوتنێکی مادی بێت، لە ڕاستیدا بە پێچەوانەی بیروبۆچوونی خەڵکییەوە ئاوات خواستن بۆ سەروەتو سامان هیچ کێشە نییە، بە هەبوونی حسابی بانکی زیاتر دەتوانیت زۆرکاری باش ئەنجام بدەیت، تەنها وابەستەبوون بە پارەوە کێشە دروست دەکات، لەبەرئەوە لە بیرتان بێت دەبێت ببەخشن تا بەدەست بهێنن، مەبەستو ئامانجەکانت بە پیرۆز دابنێ، ئاواتو ئەندێشەکانتان دەبێت یارمەتیدەربێت بۆ تەشەنەسەندنی ئاگری دەروونتان، ئەم هەستە جگە لەوەی ئیلهام بەخش دەبێت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت دەبێتە هۆی دەرچوونی شەپۆلە دەرچووەکان لە مێشکەوە بۆ جیهانی دەرەوە، بە گوێرەی یاسای کێشکردن جیهانی دەرەوەش وەڵام دەداتەوە.

لە یادتان بێت هەمووشتێك دەبێت، ئەندێشەکانی خۆت دیاریکراوو سانسۆر مەکە، دەبێت بڕواتان بە خۆتان هەبێت، بزانن بەنرخن، هەموو ئاواتو داواکارییەکانتان دێنە دی.

سەرچاوە: راە موفقیت.

# ئەندازەسازی ژیان

هاودین زانا

ژیان ئەو کایەیە کە هەمووومان پێویستە بوونو وجودی خۆمانی تیا بسەلمێنین، ئەگەر بزانین چی ئەنجام دەدەینو بۆچی ئەنجامی دەدەینو خۆمان کێینو چۆنو کەیو لە کوێوە دەست پێ دەکەین؟ بۆئەوەی سەرکەوتن مسۆگەر بکەینو بوونمان بسەلمێنینو بەرهەممان هەبێت، بە کارکردنو تێکۆشان دەبێت، بە ماندوبوونو شەونخوونیو تایبەتمەندبوون دەبێت، بە سازاندنی نەخشەیەکی رێکوپێکو گونجاوو دانانی چەندین پایەو بناغەی بەهێزە بۆ ژیان کە لە خوارەوە ئاماژەیان بۆ دەکەینو لە چەند بڕگەیەکدا ڕوونی دەکەینەوە:

١- ڕۆحت مەمرێنە: ڕۆح ئەو بەشە زیندووەی مرۆڤە کە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر بوونی مرۆڤو مەعنەویدان بە مرۆڤ، زیندوو هێشتنەوەی ڕۆحیش بە ئەنجامدانی کاری باشو ئاسوودەکردنی ویژدانو پەرستشی خواو ئەرکە ئاینییەکان دەبێت.

٢- متمانە، ئامانج: متمانە بە خۆبوون لە گەورەترینو سەرەکیترین کارەکانی ئەندازەسازی ژیانە، کاتێك مرۆڤ باوەڕی بە تواناو لێهاتووییەکانی خۆی هەبێت دەتوانێت ئەو ئامانجەی کە دیاریکردووە هەوڵ بۆ بە دەستهێنانی بداتو ماندووبوونو سەرنەکەوتن چۆکی پێدانەدات کە ئەمەش بەکارکردن دەبێت.

بۆ متمانە بەدەست هێنان، یادی خۆت بهێنەرەوە کە تۆ زۆر کاری گەورەو سەرکەوتووت بە ئەنجام گەیاندووەو تواناکانت لە توانای کەسانی تر کەمتر نییە، ئەگەر ئامانجت دیارو ڕۆشنبێت هەرچەندە دووریش بێت هەردەیگەیتێ.

٣- فشارە دەروونییەکان بە ڕێگەیەکی پۆزەتیڤو سەرکەوتوو لێکبدەرەوەو بیکەرە هاندەر بۆ زیاتر سووربوونت لەسەر کاری باشتر، لێرەدا دەبێت وریاو ژیرانە لەگەڵ کارو فرمانەکاندا هەڵسوکەوت بکەین.

تەواو ژیرانە هەنگاو هەڵبگرە، توانات بخەرەگەڕو ڕێگەی دروست هەڵبژێرە، هەرچەندە پۆزەتیڤانە بیربکەیتەوە سەرکەوتنی زیاتر مسۆگەر دەکەیت.

٤- زاڵبوون بەسەر هەستو بیرکردنەوەدا: مەهێڵەو ڕێگەمەدە کە بیرکردنەوەی ناتەندروستو زیانبەخشت هەبێت، چونکە بیرکردنەوە دەگۆڕێت بۆ کردارو ڕەفتارو ڕەوشتی تۆ، پێویستە زاڵ بیت بەسەر هەموو ئەو هەستە لاوازانەداو بیانگۆڕیت بەخاڵی بەهێزو کاریگەر لەسەر دڵو دەروونت، ئەویش بە هەوڵدانو بە دەستهێنانی خۆشبەختیو خۆشحاڵی لە ناخو قوڵایی دڵتەوە، دڵنیابە ڕێگەی ژیان پڕهەورازە، ئاڕاستەی شادیت بناسە، ڕاستە ڕێی ژیان دژوارە، بەڵام دڵنیابە شادیو خۆشبەختی دوا هەوارە.

٥- بێهیوامەبە: ئەگەر کارێکت کردو نەگەیشتیتە ئەنجامو سەرکەوتوو نەبوویت، ئەوا بێ هیوامەبەو جۆری کارکردنەکەت بگۆڕەو جارێکی ترو بە جۆرێکی تر کار بۆ ئەو هیوایەت بکە، بێهیوامەبە پاڵنەرەنێگەتیفەکان وەلابنێو پۆزەتیڤانە بیربکەرەوە، ئەدیسۆنو ئیبن حەجەرو چەندانی تر هەن کە لە یەکەم جاردا سەرکەوتوو نەبوون، بەڵام بە هیواوە ژیانو سەرکەوتن، سەلمانی فارسی یەکێکە لەوانەی کە چەندان وڵاتو شار گەڕا بۆ بەدەستهێنانی ڕاستیو خۆشبەختی دڵ، بێهیوا نەبوو هەوڵی زیاتریدا تاگەیشتە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)و ڕاستیو ئارامیو سەرکەوتنی بە دەستهێنا، هیچ کاتێك بیری لەوە نەدەکردەوە کە بچێتەوە سەرنەزانیو وێڵ بوون، چونکە هەموو ئەو ڕێگایانەی پێشتری بۆ تاقی ببووەوەو سودی لێببینی وەك لە گریمانەکانی NLPدا هاتووە، دەڵێت: ( لیس هناك فشل، ولکن هناك خبرات ونتائج)، ئەوە ئێمەی مرۆڤین لە تواناماندایە کە نەهامەتیو کەوتنو شکستەکانی ژیان بگۆڕین، بۆ چەندەها ئەزموونو کاری ناوازەو جوانو سەرکەوتوو، شاعیر جوانی وتووە کە دەڵێت:

"هیچ شت بێ هەوڵ نایەتە بەرهەم

گەر بەقیمەت بێ، یان بێ نرخو کەم
هیچ هەوڵێك بە سووك مەدەرە قەڵەم
چەند جۆگەیەکن کە دەبن بە چەم"

٦- ڕێزگرتن: ڕێز لە خەڵکی بگرەو چاوەڕێی ڕێزیان لێ بکە، هەرگیز چاوەڕوان مەبە لە خۆوە ڕێزت بگرن، چونکە دەوروبەر ئاوێنەی تۆن، زاناکانی دەروونناسی دەڵێن: {ڕێز لە خۆنەگرتن هۆکاری هەموو کێشەیەکی ئالوودەبوونە لە جیهاندا}، پێویستە لەسەر مرۆڤ کە ڕێزی خۆی لە خۆی بگرێتو دەبێت ئەوەش بزانێت کە خودای گەورە ئەوی کردووە بە بەهێزترینو بە تواناترین دروستکراوەکانی خۆیو ڕێزی لێگرتووە، وەك دەفەرموێت:"ولقد كرمنا بني آدم" کەواتە مرۆڤ بە تواناترینو بەهێزترین دروستکراوە بۆ سەرکەوتنو بردنەوەو بە دەستهێنانو گەیشتنە ئامانج، هەروەها بزانە مرۆڤێکمان نییە بە ناوی نەگبەتو بێ شانسو نێگەتیڤو خراپەوە، هەموو مرۆڤەکان توانای سەرکەوتنو بەدەستهێنانو بردنەوەیان هەیە، ئەوەش بزانە هەموو مرۆڤێك سەرقاڵو سەرگەرمی ژیانی تایبەتی خۆیەتی، ئەوەندە لێیان چاوەڕوانبە کە پێیان دەبەخشیو ڕێزیان لێ دەگریت.

٧- کاتەکانت لە ئاڵتون بە نرخترن: تۆ کات بەڕێوەبەرە، باش بزانە ژیانی مرۆڤ کاتەو بەدەر لە کات مانایەکی نییە، باش هەوڵ بدە کە کاتی تەمەنت ڕێکبخەیتو ڕووبەڕووی کارە بێ سودو بێ ماناکان ببیتەوەو بە سەریاندا زاڵبیت، چونکە کات بەشی ئەنجامدانی هەموو کارەکان ناکات بۆیە باشترینو بە سودترین کار ئەنجام بدە.

٨- سەرکەوتنو تۆمارکردنی سەرکەوتنەکانو ژماردنیان: بەختەوەری کاتێك بە دەست دێت کە مرۆڤ لە ژیانی خۆی ڕازییەو هەست دەکات سەرکەوتنی بە دەستهێناوە، ئەگەر دەڵێیت من سەرناکەومو سەریش نەکەوتووم، ئەوا دەست بکە بە ژماردنی سەرکەوتنەکانت کە لە یادت کردوون، دڵنیابە سەرکەوتنی گەورەو مەزنت تۆمار کردووە، سەرکەوتنەکان بژمێرەو پێیان ڕازیبەو هەنگاوبنێ بۆ سەرکەوتنی ناوازەترو چاکتر، هەرگیز ئەم وشانەی وەك"ناتوانم، بێ هێزم، سەرکەوتوونابم، کێ تاقەتی هەیە" مەڵێ، چونکە ئەم وشانە وشەی کەسانی بێ هیواو دۆڕاون، ئومێدت هەبێت بە ئایندەو بە چاوی گەشو دڵی ئاسودەوە بە کاری زۆرو بەردەوامەوە بەرەو ڕووی برۆ.

کارزان سەلیم

# با بە یەکەوە بژین!

بە کورتی بڵێین بە یەکەوە ژیان، واتە ژیان بە یەکەوەو سوودگەیاندن بە یەکتر، بێ ئەوەی کاریگەرییەکی خراپو نابەجێمان لەسەر یەکتری هەبێت.

بە یەکەوە ژیان لە ئاستی تاکەوە خۆی لەگەڵ خودی خۆیدا دەست پێ دەکات، پاشان بۆ بەرامبەرەکەیو پاشان ژیان لەگەڵ کۆمەڵێکدا، چونکە هەر تاکێك خۆی خاوەنی کۆمەڵێك سیفەتی خۆیەتی (تورە، هەزەلی، داهێنان، کار، ڕەخنەگر، جدی، کەسانێکیش هەن هەرشتێك ڕوویدات، یان ڕوونەدات دەڵێن بەڵێو..)، هەر ئەم سیفەتانەشن کە کۆدەبنەوەو گروپ دروست دەکەنو پاشان گروپەکە دەبێتە گروپێکی گەورەترو پاشان ئەمیش لەگەڵ ئەوانی تردا کۆمەڵگە دروست دەکەن، ڕاستە ئێمە هەموومان پلانی تایبەتیمان هەیە بۆ ژیانی خۆمان، ئەمە شتێکی جوانو سروشتییە، ئەگەر پلان دانەنێین بۆ خۆمان ئەوا دەبینە بەشێك لە پلانی خەڵکانی تر، بەڵام لەمە جوانتر ئەوەیە کە بتوانین چۆن بە یەکەوە بژین، با ئەو ئومێدەبین کە هێندەی باڵ بۆ باڵندەکان گرنگین، سوود لە چیرۆکی چوار مۆمەکە وەردەگرین:

چوار مۆم بە هێمنی دەسوتان، کەشێکی وەها هێمنو بێدەنگ بوو کە دەکرا گوێ لە قسەکانیان بگیرێت.

یەکەم وتی: من «ئاشتی»م، کەس ناتوانێت بۆ هەمیشە بە داگیرساوی ڕامبگرێت. من دڵنیام کە دەکوژێمەوە، هێندەی پێنەچوو ڕووناکییەکەی کەم بووەوەو کوژایەوە.

مۆمی دووەم وتی: من «باوەڕ»م، بوونی من زۆرپێویست نییە، کەوابوو ئەوەندە گرنگ نییە کە من داگریساوبم، لەگەڵ تەواوبوونی قسەکەی شنەبایەك هاتو کوژاندییەوە.

مۆمی سێیەم بە دلگرانییەوە وتی: من «خۆشەویستیم»، من توانای سوتانم نەماوە. خەڵکی منیان بە لاناوە لە گرنگی من بێ ئاگان. ئەوان تەنانەت دەربڕینی خۆشەویستی خۆیان بۆ نزیکترین کەسیان فەرامۆش دەکەن، زۆری پێنەچوو ئەویش کوژایەوە.

لە پرمنداڵێك هاتە ژوورەوەو لەگەڵ بینینی سێ مۆمی کوژاوە وتی: بۆچی کوژاونەتەوە؟ ئێوە دەبێت هەموتان ڕۆشن بن، پاشان بە هێمنی دەستی کرد بە گریان.

لەم ساتەدا مۆمی چوارەم وتی: مەترسە! تا ئەو کاتەی من دەدرەوشێمەوە، دەتوانم مۆمەکانی تریش دووبارە دابگیرسێنمەوە. من»ئومێد«م، بەم شێوەیە هەموومان دەتوانین ڕووناکی بدەین.

منداڵەکە بە چاوی گەشاوە مۆمی ئومێدی هەڵگرتو مۆمەکانی تری پێ داگیرساندەوە.

ئێمە پێویستمان بە یەکترە، هیچ مۆمێك بەداگیرساندنی مۆمێکی تر ناکوژێتەوە.

پێشەوامان (سەلامی خودای لێبێت) دەفەرموویت: باشترین کەس لە ناو خەڵکدا، ئەو کەسەیە کە بۆ خەڵك سودبەخش بێت.

سوود لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە/ بەهەشت، یان دۆزەخ کامیان هەڵدەبژێریت؟

و: خالد محەممەد

# گەر دەتەوێت لەگەڵ هەڵۆکان بفڕیت کاتت لەگەڵ مریشکەکان بە هەدەر مەدە

چەند جوانە لەگەڵ دەستکەوتەکان بفڕیت... چەند جوانە سەیریان بکەیتو بە بەرزیی بۆیان بڕوانیت... چەند جوانە وەك هەڵۆ هەمیشە بەرزەفڕ بیت، لە بەرزییەوە بۆ شتەکان بڕوانیت..

دەگێڕنەوە پیاوێك هەڵۆیەکی بە دیاری بە پادشایەك دا، پادشا زۆر دڵی پێخۆشبوو، لە یەکێك لە وەزیرەکانی پرسی: ڕات چۆنە دەربارەی ئەم هەڵۆیە؟ ئەویش وتی: قوربان ئەو هەڵۆیە لەگەڵ مریشکدا گەورە بووە!!

پادشا لە قسەی وەزیرەکەی زۆر سەری سوڕما، بۆئەوەی بۆی ڕوونبکاتەوە داوای لە پادشا کرد هەڵۆکە بەربدات، دەبینین وەك مریشك بە قاچەکانی زەوی هەڵدەکەنێ بۆئەوەی شتێك بدۆزێتەوەو بیخوات، وەزیرەکەش ئەوەی لەوەوە درك پێکردبوو کە ئەم هەڵۆیە هەمیشە بۆ زەوییەکەی دەڕوانی، جیا لە هەڵۆکانی تر کە هەمیشە بۆ ئاسمان دەڕوانن...

ئەوەی لەم چیرۆکەوە فێری دەبین ئەوەیە زۆرێك لەوانەی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین کاریگەریان لەسەرمان دەبێت جا بە باش، یان بە خراپ... چەند کەسمان بینیوە بە هۆی هاوڕێیەتی کۆمەڵە کەسانێکەوە هەندێك لە سیفەتەکانی خۆی لە دەستداوە، هەربۆیە پێغەمبەر (صلی اللهعلیه وسلم) فەرموویەتی: مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی..

هەروەها وتراوە: هەرکەس چل ڕۆژ لە ناو کۆمەڵێکدا بێت دەبێت بە یەکێك لەوان.. یان وتراوە: پێم بڵێ هاوڕێیەتی کێ دەکەیت، پێت دەڵێم تۆ کێیت؟

گرنگیدان بە ئەوانەی تێکەڵاوییان دەکەین زۆر گرنگە... زۆر ئاساییە کە باس لە تێکەڵاوی دەکەین خێرا باس لەوە دەکەین کە دوورکەوینەوە لە خراپەکاران... خراپ بە مانای ئەوەی سیفەتە جوانەکانمان پێ دەکەن بە خراپ..

هیممەتمان دادەبەزێننو بێهیوامان دەکەن لە تێکۆشان... ئامانجەکانمان لە بەرچاو سوك دەکەنو بێبەرنامەیی دەکەنە خۆشی ژیان...

هەموو جۆرەکان لە دەوروبەرمان هەن: باش، خراپ، جوان، ناشیرین، چالاك تەممەڵ، گەشبین، ڕەشبین، ڕووناك، تاریك، گرنگ ئەوەیە تۆ دەتەوێت لەگەڵ کامیان بیت، تۆ دەتەوێت بە کام ڕێدا بڕۆیت، تۆ خاڵی قسە لەسەر کردنی، گەر تۆ بتەوێت دنیا باش دەبێت، گەر تۆش بتەوێت دنیا خراپ دەبێت، تۆ نیگارکێشی تابلۆی ژیانی خۆتی: (گەر دەتەوێ وەك هەڵۆ بژی، لەگەڵ هەڵۆکاندا بژی).

سەرچاوە/ مدونه النجاح والناجحين.

# هیچ چاکەیەك بە کەم مەزانە!

و/ ئیبراهیم بەهادین

مامۆستا ئیبراهیم فەقێ دەڵێت: جارێکیان شتێکم بەخشی بە ئافرەتێکی هەژاری بەساڵاچوو، هاوڕێکەم پرسی: ئەوە چی دەکەیت؟ وتم یارمەتی دەدەم. وتی: زۆر هەژاری لەو بابەتە هەیە، تۆ فریای هەموویان ناکەویت! ئەو یارمەتییەی تۆ کاریگەری نابێت، لەبەرئەوەی تۆ ناتوانی یارمەتی هەموویان بدەیت! وتم: چیرۆکێکت بۆ دەگێڕمەوە بەڵکوو سوودی لێ وەربگریت:

پیاوێك لە کەنار دەریا دانیشتبوو، شەپۆلەکانی دەریا ماسییەبچووکەکانی لەگەڵ خۆی دەهێنایە کەنار دەریاکەو لە گەڕانەوەی ئاوی شەپۆلەکاندا ماسییەکان لە کەناری دەریا دەمانەوەو نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە ناو ئاوەکە، پیاوەکە ئافرەتێکی بینی دانە دانە ماسییەکانی دەگرتو فڕێی دەدایەوە ناو ئاوەکە. بەم شێوەیە چاودێری ئافرەتەکەی دەکرد تا دوای شەش کاتژمێر، ئیدی نەیتوانی لەوە زیاتر چاوەڕێ بکات، هەربۆیە لە ئافرەتەکە چووە پێشو لێی پرسی: ئەوە چی دەکەیت؟ ئافرەتەکە وتی: ماسییەکان دەخەمەوە ناو ئاوەکە تاکو نەمرن! پیاوەکە پێی گوت: لەم ماسییانە گەلێ زۆرن، تۆ فریای هەموویان ناکەویت، جگە لەوەی چەندەها کەناری تری لەم شێوەیە لە جیهاندا هەیەو ماسی تیایدا دەمرێت. تۆ بەم کارەت خۆت هیلاكو ماندوو دەکەیتو هیچ سوودێکیشی نییە!

ئافرەتەکە ماسییەکی گرتە دەستو فڕێی دایە ناو ئاوەکەو وتی: ڕزگارکردنی ئەم ماسییە بچووکە سوودی کارەکەی منە!

لە یادمە جارێکیان هەموو سامانەکەم بریتی بوو لە (١٠٠٠) دۆلار چووم بۆ مزگەوت بۆئەوەی نوێژ بکەم، دوای نوێژ پێشنوێژی مزگەوتەکە وتی: مزگەوتەکەمان پێویستی بە (١٠٠٠) دۆلار هەیە، منیش (١٠٠٠) دۆلارەکەم دایە مزگەوتو گەڕامەوە بۆ ماڵو دەستەکانم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، خوایە گیان کاری خۆم سپاردەی تۆ کرد.

کە گەیشتمەوە ماڵ یەکێك پەیوەندی پێوەکردمو داوای کرد کاری لەگەڵدا بکەمو پرسی بۆ ئەوەی کارم لەگەڵدا بکەیت مانگانە چەندت دەوێ؟ منیش (١٠٠٠) دۆلارەکەم کەڕەتی (١٠) کردو وتم: مانگانە (١٠٠٠٠) دۆلارم دەوێت، بۆئەوەی کارت لەگەڵدا بکەم، خاوەنکار هاتە لامو گرێبەستی لەگەڵدا مۆرکردم بۆ ماوەی سێ ساڵ.

سەرچاوە/ الدکتور ابراهیم فقی/ قوة الحب والتسامح

## وانەیەك بۆ ژیان

**هەوڵ مەدە جلوبەرگەکانت لای تۆ گرانبەهاترین شت بن، چونکە ڕۆژێک دادێت خۆت لە جلوبەرگەکانت هەرزانتر دێتە پێش چاوت!**

و: نیان حەمەکریم

# با ڕەچاوی یاساکانی ژیان بکەین

## بەشی دووەم و کۆتایی

**دەستنیشانکردنی ئامانج/**

ئایا بۆ ئەمڕۆو سبەینێی خۆت ئامانجێکت دەستنیشان کردووە؟ ئامانجی سەرەکیتان لەم هەموو هەوڵوکۆششو کارە چییە؟ ئەو کەسانەی هیچ خولیاو ئامانجێکیان نییە، ئەوا وزەیەکی تایبەتیش سەبارەت بە کارێك بە خەرج نادەن، هەر لەبەر ئەمە هەست بە بێهودەییو بێ نرخی دەکەن. بەڵام ئەگەر کاتێك بۆ خۆت ئامانجێك لەبەرچاوبگریت «وەك فێربوونی ژەنینی مۆزیك، بەشداری لە پاڵەوانێتییەکی وەرزشیدا، وەدەستخستنی کارو پیشەیەکی بەرز، یا بڕوانامەیەکی بەرز.... « کاتێك بەم ئامانجانە دەگەیت ئەوا هەست بە ڕەزامەندییو ئاسوودەیی دەکەیت.

هەڵەکردن عەیب نییە:

وادابنێ چویتەتە ناو کارو ڕشتەیەکی تایبەتەوەو دوای ماوەیەك تێ دەگەیت حەزت لەم ڕشتەو کارە نییە، بەڵام خۆ ئەگەر تۆ ئەم کارو ڕشتەیەت تاقی نەکردایەتەوە، چۆن دەتوانیت بگەیتە ئەم ئەنجامە؟ کارەکەمان تازە دەست پێدەکاتو هەوڵو کۆشش دەکەین تا بتوانین لە ئایندەدا سەرکەوتووبین، لە ڕاستیدا شکست کۆتایی ڕێگەکە نییە، بەڵکو سەرەتای ڕێگەکەیە.

ئامانج وروژان:

ئەگەر دەتەوێت جەستەیەکی گونجاوو سەرنجڕاکێشت هەبێت، پێویستت بە بەرنامەڕێژییەك هەیە، دەبێت هەموو ڕۆژێك ڕابکەیت، وەرزش بکەیتو پەیڕەوی لە سیستەمێکی خۆراکی تایبەت بکەیت. هەر ئامانجێکت هەبێت لە ژیاندا، بەبێ ئامانج و خواست لە ناخی دڵەوە ناتوانیت پێی بگەیتو وەدەستی بێنیت. خۆت بە ئامانجی بچووكو بێ نرخەوە سەرقاڵ مەکە، بۆ خۆت لە بیروهۆشی خۆتدا ئامانجێکی گەورە لەبەرچاو بگرە، هەوڵبدە وەدەستی بێنیت. بۆ نموونە ئەگەر دەتەوێت پارەدار بیت، نابێت بە کڕینی کەرەستەی بچوكو بێ نرخەوە خۆت سەرقاڵ بکەیت، بەڵکو دەبێت بە وردی ئامانجی خۆت لەبەر چاو بگریت. تەنانەت دەبێت ئەندازەی ئەو پارەیەشو ئەو کاتو ماوەیەش لەبەرچاو بگریت کە دەتەوێت تیایدا ئەو بڕە پارەیەت دەست بکەوێت، هەمیشە ئەم مەسەلەیەت لە بیر بێت کە: یەکەمجار دەبێت پاشەکەوت بکەیت، پاشان پارە خەرج بکەیت. نەك ئەمەی کە یەکەمجار پارە خەرج بکەیتو پاشان ئەوەی ماوەتەوە پاشەکەوتی بکەیت.

یاسای پێشکەوتن:

وادابنێ ئامانجێکت هەیە، جۆری ئامانجەکە جیاوازییەکی نییە ، ئایا وابیر دەکەیتەوە کە پێشکەوتنی تۆ ڕەوتێکی هەڵکشانی ڕاستەوخۆ بەخۆوە دەبینێت، یا ئەوەی کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەت دەبێت چەند قۆناغێکی جۆراوجۆر بەجێبێڵیت؟ دڵنیابە هەر پێشکەوتنێك چەندین هەورازو نشێوی جۆراوجۆر لە خۆدەگرێت. ئەو کەسانەی زوو نائومێد دەبنو درێژە بە هەوڵو کۆششی خۆیان نادەن لەم یاسایە بە ئاگادێنو خەبەردار دەبن.

ئەمە وێڕای ئەوەی کە کاتێك ئامانجێك بۆ خۆت لەبەر چاو دەگریت، (بۆ نموونە: خوێندن، پاشەکەوتکردن، سەرکەوتن لە یارییەکی وەرزشیدا...)، ئەم ئامانجانە بەرەو چەندین شوێنی نوێت دەباتو بە چەندین توانای جۆراوجۆرت ئاشنا دەکات، کە بەر لە دەستنیشانکردنی ئامانجەکە پێیان ئاشنا نەبووبویت. لەبەرئەوە دەستنیشانکردنی ئامانجو ئارامگرتن بۆ گەیشتن بەو ئامانجە زۆر گرنگە.

کارەکەتان خۆش بووێت: چۆن کاروپیشەیەکی نموونەیی بۆخۆت دروست دەکەیتو دەسازێنیت؟ بۆ ئەم کارە دوو ڕێگە هەیە: یەکەمین ڕێگە ئەوەیە کە ئەو کارە هەڵبژێریت حەزت لێیەتیو خۆشت دەوێت، بەڵام هەندێجار هەلومەرجەکە بە شێوەیەکە بۆ دەستخستنی دەرامەتێکی باشترو زیاتر ناچاریت بە ئەنجامدانی کارێك کە جێگەی حەزو ئارەزووی تۆ نییە. هەر لەبەرئەوە دەبێت ڕێگەیەك بدۆزیتەوە تاموچێژ لەو کارە ببینیت. واتە تۆ دەتوانیت بەبێ گۆڕینی پیشەو کارەکەشت کارێك بکەیت تاموچێژ لەو کارەش وەرگریت کە حەزت لێی نییە. هەوڵبدە لە کارەکەی خۆتدا هونەرو

شــارەزایی زیاتــر پەیــدا بکەیــتو لــەم ڕێگەیەشــەوە دەرامەتێکی باشتر بۆ خۆت دەستەبەر بکەیت.

فێربوونــی ئــەوەی کــە زۆرتریــن بەهرەمەنــدی لە پێگەی کاروپیشــەکەت وەربگریــت، یارمەتی ئــەوەت دەدات ئەو کارە دەســتبخەیت کە بە ڕاســتی خۆشت دەوێتو حەزت لێیەتی.

بیروباوەڕی ڕاستو دروست:

ڕەنگــە تۆش وەك زۆرێــك لە مرۆڤە شکســتخواردوو ڕەشــبینەکان وا بیــر بکەیتەوە مرۆڤ گەلێك هەن ســەرکەوتن بە شــادی ژیان مافی ئەوانەو تۆ لە ڕیزی ئەو مرۆڤانەدا نیتو مافو شایستەی ئەوە نیت، دیــارە ئەمەش بۆچوونێکی هەڵەیە! ئــەو مرۆڤانە هیــچ جیاوازییەکیان نییە لەگــەڵ تۆدا، تەنهــا جیاوازییــان ئەوەیە کە ســەرکەوتن بە خۆشــی ژیان بە مافی سروشــتی خۆیان دەزانــنو باوەڕیان وایە ســەرکەوتووەکان شــادمانو بەختەوەرن. هەر لەبەرئەوە ئەگەر تۆش بتوانیت باوەڕ بەخۆت بکەیتو شــادمانی بە مافی خۆت بزانیت، ئەوە بە دڵنیاییەوە تۆش شادمانو سەرکەوتوو دەبیت.

هێزی خەونەکانمان:

زۆر بە دەگمــەن ڕێکدەکەوێت بە بێ بوونی خەونو خولیاو ئەندێشــەی گەورە، بتوانیــن بــەو ئامانجانەمــان بگەین کە حەزمــان لێیانە. دەبێت هێــزی خەیاڵو وێناکردنمــان بــە گــەڕ بخەیــنو بیر لە ڕێگەگەلێکــی نوێ بکەینەوە. لە ڕاســتیدا مێشــکی مرۆڤ ئەوەی کە بتوانێت وێنای بکاتو بیری لێبکاتەوە، ئەوە دەشــتوانێت بەرجەستەی بکاتو بیهێنێتە دی.

تۆ دەتوانیت لــە خەونە گەورەکانەوە دەســت پــێ بکەیــت، تا ئــەو ســنورەی دەتوانیــت وێناکانــت بەرفــراوان بکەیت، لێگــەڕێ بیروهۆشــتان گەشــتی شــوێنو ناوچە دوورەدەســتەکان بکاتو بفڕێت بۆ ئەو ناوچانە، ترســی شکستو هەڵەکردنت نەبێــت. وردە وردە خەونەکانــت بکــەرە کاروکردەوە، لە ڕاســتیدا لە دنیای ماددی دەرەوەدا هەموو هەوڵو کۆششــێکی خۆت بۆ گەیشــتن بــەو خــەونو خولیایەت بە خەرج بدە.

هــەوڵ بدە لە نیــوەی ڕێــدا ماندوو نەبیت، لەهەر قۆناغێکدا سوپاسگوزار بە، چونکە سوپاســگوزاری ژیان دەوڵەمەندتر دەکاتو ئەوەی کە هەتە زیاتر دەبێت، ئەمە وێڕای ئەوەی دەبێتە هۆی دەستەبەرکردنی ئارامییەکی زیاتر.

سەرچاوە/ سایتی همشهری.

لە تورکییەوە

مەودود عبدالجبار

# گفتوگۆی نێوان شەم و پەروانە

لــە بیرمە شــەوێك خــەو لەچاوانم تۆرابوو... لەو کاتەدا گوێم لێبوو، پەروانە بە شــەمی دەوت: ((ئاە خۆشەویســتەکەم، مــن عاشــقی تۆم... گــەر بشســوتێم لێم جوانــەو پێم دەکەوێت، بەڵام ئەدی تۆ بۆ چ دەگریتو دەسوتێی؟

لە وەڵامدا شــەم گوتی: ((ئەی عاشقە هەژارەکــەم، هۆکاری گریانو ســوتانم بە بێدەنگی: من شیرینێکم هەبوو، (مەبەست لە کاتێکە کە لە خانەکانی هەنگدا لەگەڵ هەنگویندا پێکەوە بوون) بە جەورو ستەم منیان لەو جودا کردەوە، ئیدی چلۆن وەکو فەرهاد ئاگر بەرنەدەمە سەرم!!

شــەمی هــەژار لــە لایەکــەوە وەهای دەگــوت، لە لایەکی دیکەشــەوە بە ڕەنگی هەڵبزڕکاو و ڕوومەتی ســوتاوەوە ئەشکی چاوانی جۆگەلەیان بەستبوو...

دووبــارە ئــاوڕی دایــەوە: بــۆ لای پەروانــەو وتــی: (پەروانەکــەم... مەنۆڕە نــورو ڕوناکییەکەم لــە دیوەخانەکاندا، ئاتەشی ناخو تۆفانی ئەشکم ببینە.

عەشــق بــۆ تۆ نابــێ چــون ئەتۆ نە ئارامت هەیەو نە مەکانەت، عەشــقەکەی تــۆ بە تەنــێ گوزارشــتە لــە دەرمانێکی وشكو برنگ، ئەتۆ شوعلەیەکی بچکۆلەش ببینی بــە خێرایــی دەچیتــە خزمەتی، وەلــێ ئەمن تا دوا نەفەســۆچکەم خۆگرو ڕاوەستاوم... ئاتەشی عیشق بە تەنێ ڕووی دەرەوەو باڵەکانت دەسوتێنێ، ئەمما ئاگری عەشقی من لە ســەرمەوە دەست پێ دەکا بە پێیەکانم کۆتایی دێ.

هێشــتا لە دڵدانــەوەی یەکدی تەواو نەببــوون، پــەری ڕووخســارێك لە شــەم نزیك بووەوەو ((فوو))ێکی لێکرد... شــەمی دڵشــکاوو ســوتاو لە ســەریەوە دووکەڵی هەناســەی ســاردی بەرزبویەوەو... گیانی بەخشی...

گــەر دەتەوێت فێر بیت عاشــق بوون یانی چی؟ با پێت بڵێم: ((دەست هەلگرتنە لە سوتان بە گیان فیدا کردن)).

گــەر عاشــقێك مەعشــوقەکەی خۆی کوشــت، تــۆش چویتە ســەر مەزارەکەی، ئەمان ســەد ئەمــان نەگریەیت، نەبادا بە داوای خۆی کوشتبێتی... چەندە سەعادەت... کەواتــە موبارەك باییو تەبریکی پێ بڵێ، لە جێی گریان...

گەر عاشــقی لە ئاهو ناڵە بێزار مەبەو هەوڵی قوتار بوون مەدە، (لە حاڵێکدا هەموو فەخرو شانازییەکی عاشق داخو دەردە).

عەشــق یانی فیدابوون... فیداییش تا نەگاتە مەقســود ئەگەر بەسەر سەریشیدا بــەردو تیــر ببــارێ نــە دەوەســتێو نە دەوەستێنرێ...

مــن بە تۆ ناڵێم بــڕۆرە دەریا، وەلێ گەر ڕۆشتی بەرگەی تۆفانیش بگرە...

سەرچاوە/ (بوستان- سعدی شیرازی)

# جیاوازی نێوان مرۆڤی سەرکەوتوو و سەرنەکەوتوو

و: نەرمین عومەر

بەشی یەکەم

زۆر لە ئێمە ئەو پرسیارە دەکەین، بۆچی سەرکەوتووان، سەرکەوتوون؟ چییان کردووە بۆ ئەوەی سەرکەوتووبن؟ ئایا تواناییان لە کەسانی دیکە زیاترە؟ ئایا بەختی زیاتر لە کەسانی دیکەیان هەیە؟

ئەی بۆچی سەرنەکەوتووەکان سەرنەکەوتوون؟ چییان کەمە، تا نەتوانن سەرکەوتن بەدەست بهێنن؟ ئایا سەرنەکەوتنیان بۆ کەمیو لاوازیی تواناکانیان دەگەڕێتەوە؟ یان لە ژیاندا کەمتر بەختیان لە کەسانی دیکە هەیە؟

وەڵامەکە زۆر ئاسانە، پێویستە بزانین، جیاوازیی گەوهەریی لە نێوان سەرکەوتووانو سەرنەکەوتوواندا هەیە. بۆ ئەوەی ئەوە فێر بیت، کە لە کوێوە ڕێگای سەرکەوتن، یان سەرنەکەوتن دەستپێدەکات، ئەم جیاوازییانەی دەیانخەینەڕوو (٨) نیشانەی جیاکەرەوەن لە نێوان مرۆڤی سەرکەوتووو مرۆڤی سەرنەکەتوودا:

**١-سەرکەوتوو:** وابیردەکاتەوە، کە سەرکەتووە، هەستدەکات کەسێکی سەرکەوتووە، وەکو سەرکەوتووان هەڵسوکەوت دەکات، وەك سەرکەوتووان خەونی گەورە دەبینێت، بڕوای بە سەرکەوتنی خۆی هەیە، بڕوای بە توانای خۆی لە ڕووبەڕووبوونەوەی بەربەستو ڕێگرەکانو شکاندنیان لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجەکانی هەیە. دەبێت بزانین، کە سەرکەوتن تەنها بارێکی ناوەزیی مرۆڤە (حالة ذهنية)، ئەگەر مرۆڤ وا بیری کردووەوە، کە سەرکەوتووە، ئەوا هەموو شتێك لە کەسو هەلو ڕووداو بەرەو ڕووی دێن، لە پێناوی بەدیهێنانی ئەوەی بیری لێدەکاتەوەو ئەوەی بۆ خۆیو بۆ ژیانی پێشبینی دەکات.

**سەرنەکەوتوو:** وەك کەسی سەرنەکەوتوو بیردەکاتەوەو هەستدەکاتو هەڵسوکەوت دەکات، خەون بە بچووکترین شتەوە دەبینێت، کە پێی بگات، یان بیهێنێتەدی. یەکەم ڕێگری بچووك دەیڕووخێنێتو لەپێشیدا دەوەستێت، بڕوای بەخۆیو تواناکانی نییە، وا بیردەکاتەوە، کە هەرچەند هەوڵبدات بە دڵنیاییەوە سەرناکەوێت.

ئەمە باری ناوەزیی کەسی سەرنەکەوتووە، بە شێوەیەك هەموو ئەو شتانەی بەرەوڕووی دێن، پشتگیریی بیرکردنەوەی بەرامبەر بە خۆی دەکەن، کە ئەو سەرنەکەوتووە، ئەمانەش یارمەتیی دەدەن بۆ گەیشتن بە سەرنەکەوتن.

**پوختە:** بیر لەسەرکەوتن بکەرەوە سەرکەوتن بەرەوڕووت دێت، بیر لە سەرنەکەوتن بکەرەوە بە دەستی دەهێنیت... لە کۆتاییدا سەرکەوتن، یان سەرنەکەوتن، بارێکی ناوەزیی مرۆڤە.. ئەگەر وا بیربکەیتەوە، کە سەرکەتوویت، ئەوا سەرکەوتوویت، ئەگەر واش بیرت کردەوە، کە سەرنەکەوتوویت، ئەوا سەرنەکەوتوویت.

هەموو ئەو شتانەی بیریان لێدەکەیتەوە، ئەقڵی ناوەوەت وا وەریدەگرێت، کە ڕاستییو واقیعن، هیچ چەندوچونت لەگەڵ ناکاتو لە ژیانتدا جێبەجێیان دەکات، بۆ ئەوەی بەو جۆرە بیت، کە خۆت ویستووتە.

**٢- سەرکەتوو:** دەزانێت چی لە ژیانی خۆی دەوێت، پلانی بۆ دادەنێت، بە هەموو تواناو وزەی کاردەکات، لە پێناوی بە دەستهێنانی ئەوەی دەیەوێت، سوورە لەسەر بە دیهێنانی سەرکەوتن. بەیانیان چالاکانە لە خەو هەڵدەستێت، ئەرکەکانی ئەو ڕۆژەی دیاریدەکاتو بەوپەڕی تواناو ئارامییەوە کار بۆ جێبەجێکردنیان دەکاتو چاودێریی ئەنجامەکان دەکات، هەمیشە کار بۆ چاککردنی پلانەکەی دەکات، بە جۆرێك لەگەڵ بارودۆخو ڕووداوەکاندا بگونجێت.

**سەرنەکەوتوو:** نازانێت چی لە ژیان دەوێت، دەبینیت، زۆرکەم کاردەکاتو چاوەڕێی پاداشتە، یان لە ئاسمانەوە بەختێکی بۆ ببارێت، خواستی لە چییە بۆی بێتەدی.. خۆی بە پێشبڕکێو فێلکردن لە کاردا سەرقاڵدەکات.. بە دوای دەستکەوتی خێرادا دەگەڕێت، بێ کارکردنو هەوڵدان.. بەیانیان لە خەو هەڵدەستێت، نازانێت ئەو ڕۆژە چی دەکات، دەبینێت، کاری زۆرە بەڵام هیچیان تەواو ناکات.. ژیانی بێ ڕێکخستنەو پلانێکی نییە، ونبووەو ڕێگای خۆی نازانێت. خۆی بۆ ژیانو بارودۆخ جێدەهێڵێت، هەرچۆنێك بیباتو بۆ کوێی ببات، ئەم هیچ خۆی تێهەڵناقورتێنێت.

**پوختە:** سەرکەوتن بەخت نییە، بەبێ هەوڵو کارکردن دەستەبەرنابێت.. سەرکەوتن پێویستی بە پلانو سووربوونە لەسەر بەدیهێنانی ئامانجەکان، سەرنەکەوتن، واتە ملدانە بۆ بارودۆخو خەیاڵات.

**٣- سەرکەوتوو:** زۆر بە ئاگاو تێگەیشتووە لە ئەنجامی هەڵسوکەوتو کردارو گوفتارەکانی... بیر لە ئەنجامی هەموو شتێك دەکاتەوە، ئەو کەسو ڕووداوانە دیاریی دەکات، کە ڕەنگە لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا پشتی بگرن، بیروباوەڕی بریتییە لە (سەردەکەومو کەسانی دیکەش لەگەڵمدا سەردەکەون)، لە ڕێگەی هاوکاریی لەگەڵ کەسانی دیکەوە بەرەو سەرەوە

دەچێت، لە ڕێگەی سەرکەوتنی ئەوانەوە سەرکەوتنی خۆی بەدیدەهێنێت.

**سەرنەکەوتوو:** سەرەڕۆو بێ سەروبەرە، هەمووکات لە بارێکی کەمتەرخەمیدایە لەهەموو شتێك، کە دەیکاتو دەیڵێت. گرنگی بەو ئەنجامانە نادات، کە لەو کردارو گوفتارانەیەوە دەکەونەوە، کە کاردانەوەیان بۆ سەر خۆیو کەسانی تر چۆن دەبێت. لە ئەنجامی ئەمەشدا خۆی تووشی زۆرێك لە کێشەو ناخۆشی دەکات، تەنها بیر لە خۆی دەکاتەوە، تەنها سەرکەوتنی دەوێت، گرنگ نییە کێ لە ڕێگایدا پێشێلدەکات.

**پوختە:** مرۆڤی سەرکەوتوو، مرۆڤێکی جێگیرەو لەگەڵ هەموو کاروبارەکاندا بە چالاکانەو پۆزەتیڤانەوە ڕەفتار دەکات، بەڵام مرۆڤی سەرنەکەوتوو هەڵەشەیەو هەموو ئەو هەلە باشانەی دێنە بەردەمی لە دەستیان دەدات.

**٤- سەرکەوتوو:** لەسەر ڕێبازی سەرکەوتووان دەڕواتو شوێن هەنگاوەکانیان دەکەوێت، پرسیار لە کارەکانیانو چۆنیەتی ئەنجامدانیان دەکات، هەورەها چۆن بوونەتە کەسی سەرکەوتوو، بەو سەرکەوتنە دەناسرێنەوە. وەك ئەوان دەکات لە پێناوی بەدەستهێنانی هەمان ئەو ئەنجامانەو هەروەك ئەوان لە ژیاندا پێشدەکەوێت.

**سەرنەکەوتوو:** ژیانی بێ ڕێباز بەڕێدەکات، نە پلان دادەنێتو نە ئامانجەکانی دیاریدەکات، ڕێگە بە ژیان دەدات بۆ هەرکوێ بیەوێت بیبات، هەمیشە ملکەچە بۆ بارودۆخو کۆنترۆڵی بەسەریدا نییە.

ئەگەر لە شوێنێك کاری کرد، هیچ بۆی گرنگ نییە، ئەگەر تەنها فەرمانبەرێکی ئەرشیف بێت، گرنگ ئەوەیە موچە وەربگرێت، ئیتر هیچی دیکەی بە لاوە گرنگ نییە، چونکە ئەم کۆشش بۆ هیچ شتێك ناکاتو گرنگی بە داهاتوویو ژیانیو پێگەی پیشەیی خۆی نادات، حەزی لەوە نییە هیچ شوێن دەستێکی لە بواری کارو ژیانی خۆیدا هەبێت.

**پوختە:** ئەگەر سەرکەوتنت دەوێت، ئەوا بەدوای سەرکەوتوواندا بگەڕێ، وەك ئەوە بکە کە ئەوان دەیکەن، بۆئەوەی بەو ئەنجامانە بگەیت، کە ئەوان پێی گەیشتوون. ئەگەر بەلاتەوە گرنگ نییە، کە سەرنەکەوتوویت، ئەوا ڕێگە بدە ژیان چۆن دەیەوێت ئاوا بتبات، هەرگیز چاوەڕێی ئەوە مەبە بگەیتە ئامانج بێ پلانێك بۆ ژیانت کە لەسەری بڕۆیت، هەموو شتێك لە ژێر ڕکێفی بارودۆخدا دەبێت، نەك ڕکێفی تۆ.

# بیرکردنەوە، گەوهەری ژینە

زرنگ واژەیی

یەکێك لەو خاڵە گرنگو جیاوازانەی مرۆڤی پێ جیادەکرێتەوە لە هەموو بونەوەرێکی دیکە، ئەو هێزە کاریگەرو پڕ تەلیسمەیە کە پێی دەوترێت: (بیرکردنەوە)، ئەمەش سەرەکیترینو پێویسترین وزەی بەردەوامبوونی زیندەگییە کە پێشکەوتنی هەموو کارێكو ئافراندنی داهێنانەکانی لەسەر بەندەو هەموو جوڵەکانی ژیان وابەستەی ئەم هێزەن.

ڕاستە بوونی ئەم گەوهەرە پڕ جەوهەرە لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی دیو لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی جیاوازە، بە هۆی جیاوازیمان لە ئاستەکانی دونیابینیو ڕۆشنبیریو خوێندنەوەمان، هەروەها تێکەڵاویو وردبینیو گوێگرتن لە ئامۆژگاری کەسانی خاوەن ئەزموونو مەعریفەو بە گوێکردنیان کە زۆر گرنگو بە بایەخە بۆ فراوانکردنی ئاسۆی ئەو ڕووناکیو ڕێبەرەی ناومان نا (بیرکردنەوە)، چونکە لەگەڵ بەدیکردنی هەرجوڵەیەکی نوێو زانینی هەر شتێکی تازەدا، ئەوا بیرێکی نوێ لە هزردا گەشە دەکات.

زۆریش گرنگە هەریەك لە ئێمەی مرۆڤ خاوەنی ئایدیاو بیرکردنەوەی تایبەت بە خۆی بێتو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بە هۆی ئەم بەهرەیەوە داهێنەر بێت، نەك وەك کورد دەڵێت: (وەکو گا لە پێستێکدا)، یان وەکو مەڕ یەکێ بکاتە سەرمەشقو سەر ڕوو لە زەوی دوای بکەوێتو هەر شتێك ئەو بیڵێت بێ بیرکردنەوە پەسەندی بکات، با بیری کەس نەبێتە بازنەو سنور بۆ بیری تۆ، ئەگەر وابێ بۆچی تۆ هەیت؟ بۆ دروست بوویت؟ کە ئەو هەبێت ئیتر کوانێ چوارچێوەو جێگە پەنجەی تۆ..

بۆیە دەڵێم: گەر برپارە بوونی تۆ مانا بەخشبێت، با کەناڵی بیرکردنەوەت بۆ هەموو شتێك پەخشبێ، لە هەموو شتێ ڕابمێنە، هەر دیڕێ کەوتە بەرچاوت لێی دوودڵ مەبەو بیخوێنە، ئەو چرا ڕۆشنەی مێشکت پڕ وزەکەو دایگیرسێنە، بیرکەرەوە تا دەتوانی بەبێ سنور، تا دەگەیتە حەقیقەتی مەجاڵو دوور، چونکە بیرکردنەوە وەکو ڕووناکی بێسنورەو وەکو ئەویش ڕێ نیشاندەرە، ئەو پەندەشمان بیرنەچێت کە دەڵێت: (ئەگەر هەموومان وەکو یەك بیرکەینەوە، مانای ئەوەیە بیر ناکەینەوە)...

ئا: گوڵان حەمە ئەمین

# دیداریك لەگەڵ د. صوهەیب سەبارەت بە وێناکردن (الرؤیة)

لە سادەترین مرۆڤ تا بەهێزترینو بە دەسەڵاتترینی مرۆڤەکان لە هزرو ئەندێشەیاندا ئامانج گەلێك خۆی پەنهانداوە، بە ڕادەیەك بەشێك لە خەونی هەر کەسێك پەیوەستە بە بەشێك لە ئامانجەکانییەوە، بەڵام ئایا تەنها بوونی حەزو خواستێك بۆ بە دەستهێنانی ئامانجێك دەمانگەیەنێتە ئامانج؟ ئەگەر نا، کەواتە دەبێت نهێنی گەیشتن بە ئامانج چی بێت؟ چۆن بتوانین بە ئامانجەکانمان ژیانی خۆمانو کۆمەڵگا بگۆڕین؟ دەربارەی ئامانجو خەونەکان وتراوە: (دەستکەوتەکانو کارەکانی ئەمڕۆ، خەونەکانی دوێنێ بوون)، لەم ڕوانگەیەشەوە شارەزایانی بواری (N-L-P-)و (دەروونناسی) ئامۆژگاریمان دەکەن بە وێناکردن، جۆرج بەرناردشۆ دەڵێت: (وێناکردن سەرەتای داهێنانکارییە). هەروەها ئەلبەرت ئەنیشتاین دەڵێت: (وێناکردن لە زانین گرنگترە)، بۆ زیاتر تێگەیشتن لە چەمکی وێناکردنو کاریگەری وێناکردن لە بە دەستهێنانی ئامانجەکان، دیدارێکمان لەگەڵ بەڕێز (د. صوهەیب ئامێدی) ڕاهێنەر لە بواری گەشەپێدانی مرۆییدا سازدا:

**بڕیار/ وێناکردن واتای چی دەگەیەنێت؟**

**د. صوهەیب:** وێناکردن، بە زمانی عەرەبی (الرؤية)، بە ئینگلیزی (vision)، وێنایەکە خۆت دەیکێشیت بۆ ئامانجێکی دیاریکراو لە ئایندەدا، ئەم ئامانجە لە سەر ئاستی تاك بێت، یاخود ڕێکخراوو کۆمپانیاو حیزبو ئۆرگان... چەمکێکە لە زانستی بەڕێوەبردنی تازەو پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، بۆ وێناکردن لە سەرەتاوە پێویستمان بە پەیام (الرسالة) هەیە، پاشان وێناکردن، وێناکردن جۆرێکە لە ئامانج، ئامانج سێ جۆری هەیە: (قريب المدى) ئامانجی نزیك، لە ماوەی هەفتەیەکدا، (متوسط المدى) ئامانجی مامناوەند، لە ماوەی ساڵێك بۆ پێنج ساڵدا، (بعيدالمدى) ئامانجی ستراتیژی، ئامانجی درێژخایەن، ئەم ئامانجە بە (الرؤية) ناسراوە، دەکرێت بۆ ماوەی (٥٠٠) ساڵیش بۆ بەڕێوەبردنی وڵات دابنرێت.

لێرەدا بۆمان ڕوون بووەوە کە وێناکردن بەشێکە لە پلان، بەڵام چ کاریگەرییەکی هەیەلەسەر پراکتیزەکردنی ئەوپلانە؟

ژیان بەبێ پلان وەك تاك دەبێتە فەوزا، وەك حیزبو ئۆرگانو ڕێکخراوو کۆمپانیاش نەبوونی پلان خۆی پلانێکە بۆشکستهێنان، وەك وتراوە: (إذا فشلت فى تخطيط فقدخططت للفشل)، شتێك نییە بە ڕێکەوتن دروست ببێت، هەر کارێك پلانی بۆ دانەنێیت بە دڵنیاییەوە ناگەیتە ئامانج، پێویستە بزانی ئەو پلانەش کە دایدەنێیت لە چ جۆرێکی پلانە؟

**بڕیار/ باسی جۆرەکانی پلانت کرد، جۆرەکانی پلان چین؟**

**د.صوهەیب:** پلان چوارجۆری هەیە:

١- (reactive planning) ئەم جۆرە پلانە گەڕانەوەیە بۆ دواوە بۆ نموونە کەسێك لە ڕووی زانستی، پەروەردەیی، دارایی،... پێشتر باشبووە، بەڵام بەردەوام حەز لەو ڕابردووە دەکات، دەخوازێت کە بەردەوام لەو بارودۆخەدا بووایە، بەشێکی زۆری خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەم

جۆرەن کە ئەمە دواکەوتووترین جۆری پلانە.

٢- (in active plan) ئەمجۆرەش کاتێك دەگاتە ئاستێکی باش لە ڕووی دارایی، زانستی،... پلانێك دادەنێت بۆ پارێزگاریکردن لەو دەستکەوتەی بە دەستی هێناوە ئەم جۆرە تارادەیەك باشە.

٣- (pre active plan) کاتێك سەیر دەکات ئەو ژینگەیەی تێیدایە باشترە، پلانێك دادەنێت کە لە ئایندەدا باشتربێت.

٤- (pro active plan) ئەمجۆرە باشترینیانەو پەیوەندی بە وێناکردنەوە هەیە خۆت بەو جۆرەی دەتەوێت لە ئایندەدا چۆن بیت وێنای خۆت دەکەیت، بۆ نموونە وێنایەك دادەنێیت بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی لە ماوەی پێنج ساڵداو هەنگاوەکانی دیاری دەکەیت.

**بڕیار/ جیاوازی لە نێوان حەزو وێناکردندا چییە؟**

د. صوهەیب: وێناکردن لە نێوان خەونو خەیاڵدایە، گەر ڕاپرسییەك بکرێت لە نێوان لاواندا لە ٪٩٠ی حەز بە فێربوونی زمانی ئینگلیزی دەکەن، بەڵام پاش (١٥) ساڵی تریش لە هەمان کۆمەڵە لاو ڕاپرسییەکە دووبارە بکرێتەوە، هەمان حەزیان هەیە بەبێ ئەوەی هەنگاویان بۆ نابێت، لەبەرئەوەی وێناکردنیان نەبووە بۆی، خەیاڵیش ئەوەیە بۆ نموونە کەسێك بە دیار بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنەوە دادەنیشێت، وەك (وزن ذهب) وابیر دەکاتەوە کە ڕۆژێك لە ڕێی وەها بەرنامەیەکەوە دەگاتە سەروەتو سامانێکی باش، بەڵام ئەمە هیچ بنەمایەکی نییە، خەونیش بە هەمان شێوە مرۆڤ بە خەون دەگات بە زۆر شت، بەڵام لە ڕاستیدا وانییە، وێناکردن ئەوەیە پراکتیزەکردنی لەگەڵدا بێت، کەسانی ئێمە تەنها خواستیان هەیە بۆیە هەست بە ماندوبوون دەکات نازانێت بەرەو کوێ دەڕوات، نازانێت چەند لە ئامانجەکەی نزیك بووەتەوەو چەندی ماوە، بە هۆی وێناکردنی ئایندەمانەوە دەتوانین ژیانمان ڕێکبخەینو هەنگاوەکانمان دیاری بکەین، هەر کات مرۆڤ هەستی کرد بەشێك لە خولیاکانی بەدیهاتووە هەست بە ئارامی دەکاتو سورە لەسەر بەدیهێنانی هەنگاوەکانی تریشی، نابێتە بەشێك لە پلانی کەسانی دی بێگومان هەرکەس (الرؤية)ی نەبوو کەسانێك کاتەکانی بۆ پڕدەکەنەوە.

**بڕیار/ بنەماکانی وێناکردن چین؟**

د. صوهەیب: وێناکردن هەنگاوی دووەمە لە دوای پەیام، لە پەیامدا ئاراستەی خۆت دیاری دەکەیت پاشان وێنای دەکەیت، دەبێت پەیامو وێناکردن زۆر گونجاوبن، بنەمای دووەم دەبێت وێناکردنێکی ڕاستەقینە بێتو لەگەڵ واقیعی ژیانی کەسەکەو هەوڵی کەسەکەدا گونجاو بێتو هەنگاو بە هەنگاو بێت.

**بڕیار/ بەڵگەی زانستی هەیە لەسەر گرنگیو کاریگەری وێناکردن لە ژیاندا؟**

د.صوهەیب: وێناکردن پێشکەوتووترین جۆری پلانەو بە درێژایی مێژوو هەر ئەو کەسانە سەرکەوتوو بوون کە پلانیان هەبووە، هەروەها نموونەی زیندووی وێناکردنی (دوبەی)مان هەیە، گەر بەراوردێك بکەین لە نێوان ئێستاو (٢٠-٣٠)ساڵی پێش ئێستایدا، جیاوازییەکی زۆر فراوان بەدی دەکەین، کە بە وێناکردن گەیشتوونەتە ئەو ئاستەی ئێستا، ئێستاش حاکمی دوبەی کتێبێکی نووسیوە کە بریتییە لە وێناکردنی ئەو بۆ ساڵی (٢٠٥٠)ی دوبەی، بە ناوی (الرئيتي ألفين وخمسين)، لەسەر ئەو بنەمایە ئەو وڵاتە بەرەوپێش دەچێت، هەروەها لە زانکۆی (هارڤارد) لە ساڵی (١٩٧٠) لێکۆڵینەوەیەك ئەنجامدرا لەسەر (١٠٠) خوێندکار تەنها (٣) خوێندکار وێناکردنیان هەبوو بۆ بیست ساڵی ئایندەیان، (٩٧) خوێندکار بێ پلان بوون لە ساڵی (١٩٩٠) لە سەر هەمان (١٠٠) خوێندکار لێکۆڵینەوەیان ئەنجامدا دەرکەوت تەنها ئەو (٣) خوێندکارە گەیشتبوونە ئامانجەکانیانو سەرجەم خوێندکارەکانی تر هەر بێ ئامانج مابوونەوەو هەریەکێکیان کارێکی زۆر سادەیان هەبوو، هەروەها لە ئاینی ئیسلامیشدا بەڵگەمان هەیە لەسەر ڕاستو تەواوی وێناکردنو بەڵکو خوای گەورە فێرمان دەکات کە وێنای داهاتوومان لە پێش چاوبێتو کاری بۆ بکەین، وەك دەفەرموێت: (ولتنظرنفس ماقدمت لغد)، هەروەها یوسف پێغەمبەر پلانی (١٥)ساڵی داناو وێنای هەنگاو بە هەنگاوی کێشا کە لە (٧)ساڵی یەکەمداچی دەکاتو لە (٧)ساڵی دووەمدا چی دەکاتو لە ساڵی پانزەهەمدا چی دەکات.

**بڕیار/دوا ئامۆژگاری بەڕێزت وەك ڕاهێنەرێکی بواری گەشەپێدانی مرۆیی چییە؟**

د . صو هە یب : هە مو و کە سێك دەتوانێت کاری گەورەو ئاوازە ئەنجام بداتو بگاتەخواستەکانی، ئەو مرۆڤانەی جیهانیان گۆڕیوە لە ڕووی لاشەییو لە ڕووی ژیرییەوە جیاوازییان لەگەڵ کەسانی تردانییە، تەنها ئەوەندە هەیە ئەوان توانیویانە وێنای باشی ئایندە بکەنو کۆششیان بۆ کردووە، گەنجانی ئێمەش زۆر بە توانانو زۆریش ماندوو دەبن، بەڵام بە هۆی بێ پلانییەوە بەرهەمیان وەك پێویست نییە، گەر وێنایەکی باشیان بۆ ئایندە هەبێت سەرکەوتنی گەورە بە دەست دەهێنن.

# دەنگدانەوەی ناخ

و: محەممەد موسا

کوڕێك لەگەڵ باوکیدا بەسەرچیاکاندا هەڵدەگەڕان، لە ناکاو کوڕەکەی بەردەبێتەوەو ئازاری پێدەگاتو هاوار دەکات.

«ئائائاه ه ه ه ه ه!»

دەنگێك سەرسامی کرد، گوێی لە دەنگەکەبوو دووبارە دەبووەوە، لە شوێنێك لە چیاکەدا: «ئائائاه ه ه ه ه ه!»

سەیرە، هاوار دەکا: «تۆ کێی؟»

وەڵامەکەی پێدەگاتەوە: «تۆ کێی؟»

ئینجا هاواری کردە چیاکە: «خۆشم دەوێیت»!

دەنگەکە وەڵامی دەداتەوە: «خۆشم دەوێیت»!

لە وەڵامەکە تووڕەبوو، هاواری کرد: «هەی ترسنۆك»!

وەڵامەکەی پێدەگاتەوە: «هەی ترسنۆك»!

سەیری باوکی دەکات و دەپرسێت: «چی ڕوودەدات؟»

باوکی پێدەکەنێو دەڵێت: کوڕەکەم، ئاگاداربە!»

دووبارە کوڕەکە هاوار دەکات و دەڵێت: «تۆ پاڵەوانیت»؟

دەنگەکە وەڵامی دەداتەوە: «تۆ پاڵەوانیت»!

کوڕەکە زۆر سەرسام دەبێت، بەڵام تێ ناگات.

پاشان باوکی ڕوونی کردەوە: خەڵکی بەمە دەڵێن دەنگدانەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە ژیانە. هەموو ئەو شتانەت پێ دەداتەوە کە دەیڵێیت، یا ئەنجامی دەدەیت.

ژیانمان بە ڕوونو ئاشکرایی بریتییە لە ڕەنگدانەوەی کردارەکانمان.

ئەگەر حەزت لە خۆشەویستی زیاترە لە جیهاندا، خۆشەویستی زیاتر لە دڵی خۆتدا دروست بکە.

گەر لە تیمەکەت تواناو کارامەیی زیاترت دەوێت، تواناو کارامەییت چاکتر بکە.

ئەو پەیوەندییە بۆ هەموو شتێك لە لایەنەکانی ژیان جێبەجێ دەبێت!

ژیان هەموو شتێکت پێ دەبەخشێتەوە لەوەی پێت بەخشیووە.

ژیانت ڕێکەوت نییە، بەڵکو ڕەنگدانەوەی تۆیە!»

# بۆ ئەوەی به بەختەوەری بژیت

ڕەوا بەرزنجی

- بە یادی خودا گوناهەکانت، هەڵدەوەرێت، دڵت ئارام دەبێت، خەموخەفەت لا دەچێت.

- چاوەڕوانی سوپاس لە کەس مەکە، پاداشتی خودا بەسە، گوێ مەدە بەو کەسانەی بەرامبەر تۆ سپڵەن، یان ڕقو کینەو ئیرەییت پێ دەبەن.

- کاتێك گەیشتیتە بەیانی، چاوەڕێی ئێوارە مەکە، تەنها بە گوێرەی ئەم ڕۆژە کاروبارت چاكو ڕێكوپێك بکەو بژی.

- دڵت لە ئیرەیی، ڕق، بوغزو قین، بەربەرەکانی، خاوێن بکەرەوە.

- بڕۆ بۆ دەشتو چیاو دۆڵەکان، تەماشای باخچەی جوانو ئەفراندنو دروستکراوەکانی خوای گەورە بکە.

- ڕۆژانە کاتێك دابنێ بۆ وەرزش کردن، بە پێ هاتووچۆ بکە، تەممەڵی مەکە، لە دەست بەتاڵیو بێکاری دووربە.

- بەردەوام ژیانت نوێ بکەرەوە، شێوازی ژیانت جۆراو جۆر بکە، هەڵسوکەوتە دووبارەکانت بگۆڕە.

- لەو کەسە ببورە کە ستەمی لێکردوویت، ئەوەی سەردانت ناکات تۆ سەردانی بکە، نەرمونیان بە لەگەڵ ئەو کەسانەی ئازاریان داویت، بە دڵخۆشیو ئاسوودەیی دەژیت.

- بزانە بە دوای ناخۆشیو خەمدا، خۆشیو ئاسوودەیی دێت، بەردەوامی بۆ هیچ شتێك نییە، ڕۆژگاریش لە خولانەوەیە.

- چاکە لەگەڵ خەڵکدا بکە، لەوانە، سەردانی نەخۆش، یارمەتیدانی هەژار، هاریکاریو بەخشینی سۆز بە منداڵانی بێ باوك، بێگومان بە، دڵت خۆش دەبێتو ئاسوودە دەبیت.

- خەموخەفەت، برسێتی، هەژاری، نەخۆشی، قەرزداری، کارەسات، لێقەومان، لای خودای گەورە پاداشتی هەیە.

- بەردەوام چاکە بکە، بەخشندە دڵی خۆشە، دەروونی ئاسوودەیە، بەڵام کەسی ڕەزیلو پیسکە هەمیشە دڵتەنگو دەروون تاریکە.

لەگەڵ خەڵك ڕووت خۆش بێت، بە نەرمو نیانی گفتوگۆیان لەگەڵدا بکە، ئەو کات تۆیان خۆش دەوێت.

- هەڵسوکەوتی سروشتی خەڵك قبوڵ بکە، لێیان ببورەو لە هەڵەکانیان خۆشبە، مرۆڤ بەم شێوەیە لە ژیاندا دروستکراوە.

- ڕۆژانە کاتژمێرێك بۆ بیرکردنەوە لە خۆتو کاروباری ژیانی دنیاو دوارۆژت تەرخان بکە.

- هەمیشە لە سڵاوکردندا دەسپێشخەربە، با ڕووت خۆشبێو بایەخ بە خەڵکی بدە، تا لە دڵیان نزیك بیتو تۆیان خۆش بوویێت.

- خێروچاکە ئەنجام بدە، با کەمیش بێت، دڵ خۆش دەکاتو خەم ڕەوێنەو ڕۆزیش زیاد دەکات.

- بۆئەوەی یادی ئەو بەهرەو چاکانە بکەیتەوەکە خودا پێی بەخشیوویت، سەردانی نەخۆشخانە بکە، تا سوپاسی خودا بکەیت، لەسەر بەهرەی لەشساغیت، سەردانی بەندیخانە بکە، تا سوپاسگوزاری بەهرەی ئازادیی بیت، سەردانی نەخۆشخانەی دەروونی بکە، تا سوپاسی خودا بکەیت لەسەر ئەو ژیرییەی پێی بەخشیوویت.

- ئاسۆی بیرکردنەوەت فراوان بکە، بیانوو بۆ ئەو کەسانەی ئازاریان داویت بهێنەرەوە، هەرگیز لە هەوڵی تۆڵەسەندنەوەدا مەبە، بۆئەوەی بە ئاسوودەیی بژیت.

دوای برسێتی تێرییە، دوای تینوویەتی تێرئاوخواردنەوەیە، دوای نەخۆشی لەشساغییە، دوای هەژاری دەوڵەمەندییە، دوای خەمو خەفەت کەیفو خۆشییە.

- بۆ تەنگانە نوێژ باشترین چارەسەرە، ڕۆحو دەروونی مرۆڤ بۆ بەرزایی نوورو سەرکەوتنو ڕزگاربوون دەبا.

- لە دوای فرمێسك زەردەخەنە دێت، لە دوای کارەسات خۆشی دێت، لەگەڵ لێقەومان بەخشین هەیە، ئەمە یاسای ژیانە.

- خواردن یەك ڕۆژ دڵخۆشت دەکات، گەشتکردن، یەك هەفتە، هاوسەرگیری یەك مانگ، سەروەتو سامان، یەك ساڵ، ئیمانو باوەڕ دڵخۆشی هەموو ژیانە.

- خاوەن ڕەوشتو ئەدەبو هەڵسوکەوتی جوان، دڵی خۆیو خەڵکی کامەران دەکات، دەروونی ئاسوودەو گوزەرانی باش دەبێت.

## ڕاهێنانی

# مێشك

به وردی لەم وێنەیە ورد بەرەوەو

هێزی مێشكو بیركردنەوەت بخەرەكار

بزانە چی دەبینیت؟ تا چ ڕادەیەك دیدی تێڕوانینت وردە؟

## خێزانی بەختەوەر

# چۆن پێشوازی لە مانگی ڕەمەزان دەکەین؟

بەری شێخ کەریم

واچەند ڕۆژێکە مانگی ڕەمەزان دەستی پێکردووە، لەنێو هەموو ماڵێکدا خێزانەکان بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لەم مانگە پیرۆزە دەکەن، لەم ژمارەیەدا بەهۆی چوونە نێو مانگی ڕەمەزانەوە بە پێویستم زانی لە گۆشەی خێزانی بەختەوەردا چەند زانیارییەك لەسەر ڕۆژووگرتن باس بکەم، تا خێزانەکان بە هۆی زیاتر ڕێزگرتنیان لەم مانگە پیرۆزە بەختەوەرو ئاسوودەبن، تا هاوسەران پێکەوە زیاتر بەختەوەرو شادمان بن، با ڕێز لەم مانگە بگرین، چونکە لە خێزانێکی بچوکەوە کۆمەڵگا دروست دەبێتو هەر لە خێزانەوە باشو خراپ دروست دەبێت.

بۆیە ئەم مانگە بوارێکی زۆر گونجاوە بۆ گەڕانەوەی مرۆڤەکان بۆ ڕێگای چاکەو وازهێنان لە کاری خراپە، بۆئەوەی دەروون زیاتر ئاسوودە بێت، با هەموو خێزانێك لە نێو ماڵەکەیدا هەوڵبدات ڕێز لەم مانگە بگرێت، تا ببێتە هۆکارێك بۆ کۆبوونەوەی خێزانەکان لەسەر بنەمایەك ئەویش خواپەرستییە، هەر خێزانە لە ماڵی خۆیدا بە تایبەتی پێویستە لەسەر دایکانو باوکان منداڵەکانیان فێری ڕێزگرتنی ئەم مانگە بکەن، بە تایبەتی ئەو منداڵەی کە توانای ڕۆژووی هەیە شێوازی هاندانو خۆشحاڵی لەلا دروست بکات، هەروەك پێشەوا غەزالی دەفەرموێت: (منداڵ ئەمانەتێکە لە لای دایكو باوکی ئەگەر لەسەر چاکە ڕابهێنرێت ئەوە فێر دەبێت و بەردەوام دەبێت لەسەری)، هەر خێزانە لە ماڵی خۆیەوە دەست پێ بکات منداڵەکانی فێری ڕێزگرتنو ئادابی ئەم مانگەی بکات، لەوێوە هەموو تاکەکانی کۆمەڵ ڕێگای خودا دەگرن و دوور دەکەونەوە لە خراپە، جگە لەوەی تەنها ئەو کەسە تاموچێژی ڕۆژوو دەزانێت کە بەڕۆژووە! چەندە خۆشحاڵو ئاسوودەیە وادەزانێت هەموو ڕۆژێك کاتێك بەربانگ دەکات دیارییەکی گەورەی خەڵاتکراوە. بۆیە بە کورتی باس لە سوودەکانی ڕۆژوو دەکەین وەك لایەنێکی کۆمەڵایەتیو تەندروستی:

ڕۆژوو دروستبوونی خۆشەویستی تاکەکانی خێزان: هەرچەندە ڕۆژوو خواپەرستییە، نهێنییەکە لە نێوان بەندەو خوادا، بەڵام چەند شوێنەوارێکی کۆمەڵایەتی لێوە دروست دەبێت، چونکە بە نزیکبوونەوەی زیاتر لە پەروەدگار خەڵکی خۆشەویستیان بۆ یەکتری زیاتر دروست دەبێت، ئەگەر سەرنج بدەین زۆرجار لە ڕەمەزاندا یەکتر ناسین تاکەکانی خەڵکی زیاترە هەتا کاتەکانی تر، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لایەنی دەروونی وەك لە سەرەتاوە باسمان کرد کاتێك مرۆڤ بە ڕۆژوو دەبێت لایەنی ئاسوودەییو ڕەحمو سۆزی زیاتر دەبێت، هەروەك پێغەمبەر (درووودی خوای لێبێت) دەفەرموێت: ((الأرواح جنود مجندة فما تعارف منها ائتلف وما تناكر منها اختلف)). واتە: ((دڵەکان وەکو سەربازانی شەڕ وەهان ئەوانەیان کە ئاشنایی پەیدا دەکەن هۆگری یەکتر دەبن ، ئەوانەش کە نائاشنان ناکۆك دەبن)).

چەندەها بەڵگە هەیە دەیسەلمێنێت کە هەمیشە شێوازی یەکتر ناسین لە هۆگربوونەوە دروست دەبێت، بێگومان ئەمەش بەبێ بوونی هەستو خۆشەویستی ناکرێ، واتە: بوونیەتی مرۆڤ بەو شێوەیە، کاردەکات لە بیرو هەستو سۆزو هەر کەسەش بەجۆرێکە وەك وتراوە.

بۆیە مانگی ڕەمەزان هاتووە جارێکی تر بۆ سەر لە نوێ ڕێکخستنو تەبایی خێزانەکانو زیاتر لە یەکتر نزیکبوونەوەو هاوکاریکردنی یەکتری، بێگومان دەرفەتێکی گەورەیە با لە دەستی خۆمانی نەدەینو بەرنامەیەك دابڕێژین بۆ ژیانی ڕۆژانەمانو بۆ خێزانو منداڵەکانمان، کاتێك بۆ کۆبوونەوەو دانیشتن کە پێکەوە ڕاووبۆچوونمان بەرامبەر یەکتری دەربڕین شێوازی ئامۆژگاریو هاندان بۆ جێبەجێکردنی کارە باشەکان فێری یەکتری بکەین، نەك تەنها بە ڕۆژ بەردەوام بە خەوتنو بە شەویش دانیشتن هەتا بەیانی بە سەیرکردنی تەلەفزیۆنو بەرنامە بێسوودەکان بەسەر بەرین.

ڕۆژوو باشی تەندروستی: هەروەك زانایەك دەڵێت: (دەوڵەمەندترین شت لە لەشی مرۆڤدا لەش ساغییە). کاتێك هەر یەکێکمان نەخۆش دەکەوین بێئومێد دەبین لە دنیا وادەزانین جارێکی تر چاك نابینەوە، بەڵام کاتێك پزیشکێك یا کەسێك پێشنیارمان بۆ دەکات بە بەکارهێنانی دەرمانێك، یا شتێك بێگومان ئاواتەخوازین دەستگیرمان بێتو بەکاریبهێنین، بەڵام خوشكو برایانی بەڕێز ڕەمەزان چەند ڕۆژێکە دەستی پێکردووە بە ڕۆژووبوون گەورەترین چارەسەرە بۆ هەموو نەخۆشییەك، پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) پێش چەندەها ساڵ لەمەوپێش ڕوونی کردووەتەوە، زانایان تازە ئەم شێوازی تەندروستیەیان بۆ دەرکەوتووە. هەروەها ئیبن قەیم دەفەرموێت: ((الصوم

جنة من أدواء الروح والقلب والبدن، منافعه تفـوت الاحصاء)) واته: ((ڕۆژوو پەرژینێکه بۆ نەخۆشـییەکانی جەسـتەو دڵو لاشه، سـوودەکانی ناژمێرێـت)) وەك لایەنێکـی خواپەرست مرۆڤ پاك دەکاتەوە لە تاوان، بەهەشتێکە بۆی دەیپارێزێت لە ئاگر، بەڵام وەك لایەنـی دنیایی سـوودی زۆری هەیە بۆ پاراسـتن لە نەخۆشـی، بۆ نموونە بۆ گەدەو ڕیخۆڵەکان، چونکە ماوەیەکی زۆرو بـە بەردەوام کاری هەرسـکردن جێبەجێ دەکات، بـەڵام کاتێـك بـە ڕۆژوو دەبێت ئەو ماوەیە ئیسـراحەت دەکات، ئەو ماددە ئیفرازاتە زیانبەخشـانە لـە کاتی بەڕۆژو بووندا لاشـە دەریـدەدات. بۆیە چەندەها زانـا هەبووە بێباوەڕ بوون، بەڵام بە هۆی دەرکەوتنی ڕاستی ئەم زانیارییە باوەڕیان هێنـاوە وەك زانایەکـی ئەمریکـی کە لە بواری خواردنو خواردنەوە شـارەزایە بە ناوی (أندریا وایلر) باس لە ئیسـلام بوونی دەکات پاش دەرکەوتنی سوودی ڕۆژوو کە پێش چەندەها ساڵ باسکراوە، پاش ئەوەی کە ئەم زانیارییەی بۆ دەرکەوتووە باوەڕی هێنـاوەو دەڵێـت کـە: پاش ئـەوەی بۆم دەرکەوت ڕۆژوو هۆکارێکی سـەرکەوتووە بۆ دووبارە کارکردنی لاشـەو پاککردنەوەو دەردانی چەوری مادە زیانبەخشـەکان، کە لە ناو لاشەی مرۆڤدان، لە ناوچوونی ئەو ئەندامـە مردوویانەو چەندەها سـوودی تر کە بە شـێوەیەکی دوورودرێژ باسـیان دەکات)، بەڵگـەی زیاترمان بۆ سـەلماندن سـوودی ڕۆژوو بـۆ گـەدەو ڕیخۆڵـەکان ئەوەیە کە لوقمانی حەکیم (سڵاوی خوای لێبێـت) ((یابنی إذا امتـلأت المعدة نامت الفكرة وخرسـت الحكمـة وقعدت الأعضاء عن العبادة)) واته: [ڕۆڵەگیان کاتێك گەدە پڕ دەبێت بیروهـۆش دەخەوێت، دانایی لاڵ دەبێتو ئەندامەکان لە خواپەرسـتی دەکەون].

ڕۆژوو بیرکردنەوە لە ژیانی نەداران:

کاتێـك مـرۆڤ بـە ڕۆژوو دەبێـت تووشـی برسـێتی و تینوویەتـی دەبێت، بیر لـە ژیانی ئەو کەسـانە دەکاتەوە کە هـەر وەك ئـەو مرۆڤـن بەڵام هـەژارن، پاشـان ڕەمەزان هەموو چینەکان پێکەوە کۆدەکاتـەوە، دەوڵەمەند بیـت، یا هەژار، دەبێـت هەموویان بە ڕۆژوو بن. بۆیە دوا وتەم بۆ هەموو خێزانەکان ئەوەیە با لەم مانگەدا ئەو کەسـانەی هەژارنو بێباوکن بەسـەریان بکەینـەوەو یارمەتیان بدەین، ئەو کەسانەی نەخۆشن سەردانیان بکەین، ئەوانەی دڵشکاوو زیزن سەردانیان بکەین، بە وتەکانمان دڵخۆشییان بدەینەوە.

# ژیان فێری کردم

**ژیـان فێری کـردم:** تێپەڕبوون بە سەردەمی نارەحەتیو کۆسپو تەگەرەکانی ژیاندا، وەکو (پیشەیی، ماددی، کۆمەڵایەتی، خێزانی، تەندروسـتی)، کارێکی ئاسـاییو سروشـتییە، چونکە ژیان لـە چوار وەرز پێکهاتـووە، ناتوانیـن وەرزی پایـز، یان زسـتان، یـا هاوینـی گەرمو وشـك، ڕەت بکەینەوە، کەواتە پێویسـتە لە هەر چوار وەرزەکە، دان بە خۆماندا بگرین!

**ژیـان فێری کردم:** پێویسـت نییە مـرۆڤ هەموو شـتەکانی دەوروبەری بە چـاوی خـۆی ببینێت، پاشـان بـڕوا بە بوونـی بهێنێت، مەگەر هـەر یەکێك لە ئێمە بڕوای بـەوە نییە.. کە هەوا بوونی هەیەو ناشتوانێت بیبینێت؟ ئایا هیچ کام لە ئێمە پێش داهێنانـی کارەبا، ڕووناکی گڵۆپەکانـی بینیوە؟ کەواتـە مەرج نییە ئەوەی ئێمە نەیبینین بوونی نەبێت!!

**ژیان فێری کـردم:** تاقیکردنەوەی جۆری زێڕ، بە ئاگر دەبێت!

**ژیـان فێـری کـردم:** جوانتریـن هەسـتەکانت، بریتییـە لـەوەی تـۆ لە ناختدا هەست بکەیت، هەنگاوێکی ڕاستو دروستت ناوە، ئەگەرچی هەموو جیهانیش دژایەتیت بکەن.

**ژیان فێری کردم:** ئەو کەسەی زۆر پێ دەکەنێت، ئەو کەسەیە کە لە کۆتاییدا پێ دەکەنێت!!

**ژیان فێری کردم:** هەموو ئەو شتانەی لەم ژینەدا قەبارەیـان گەورەیە، دەتوانین بیانکەینە پارچەی بچووك بچووك!

**ژیـان فێـری کردم:** کەسـانێك هەن دەیانەوێـت بەرهەمەکانیان بچننەوە، پێش ئـەوەی پێ بـگات، نازانـن بەرهەمی پێ نەگەیشـتوو، لەبـری سـوود زیانی هەیە. لەبەرئەوە فێربە.. .. چۆن ئارام دەگریت؟! پێـش چنینـەوەو گەیشـتن بـە هیـواو خەونەکانت!

**ژیان فێـری کردم:** پێویسـتە مرۆڤ زمانی بە کارنەهێنێت بۆ شکاندنی پشتی!

**ژیان فێـری کـردم:** تەنانەت ئەو کەسـەی ناپاکی لە نیشـتمانەکەی دەکات، هۆکارو بیانوو بۆ ناپاکییەکەی دەهێنێتەوە، بـەڵام ئـەو بیانـوو هۆکارانـە تۆمەتـی ناپاکییەکـەی ناسـڕنەوە، لەبەرئـەوەی بیانووگەلێك هەن لە تاوان قێزەونترن!

**ژیـان فێری کـردم:** ئەو کەسـەی دەسـتی لە نێـو ئاگردایەو قسـە دەکات، هەڵسوکەوتـی جیـاوازە لـەو کەسـەی دەستی لە نێو ئاودایە، بەمەش بە تەواوی دەزانین هەسـتی ئەو کەسـەی بە گۆچان دەڕوات، جیـاوازە لەو کەسـەی گۆچانەکە دروست دەکات.

**ژیـان فێری کـردم:** هیـچ کات لە کێبەرکێ نەترسم، چونکە کێبەرکێ مرۆڤ ناچار دەکات هەموو هەوڵەکانی ببەخشێت، بەمەش ماسوولکەکانی گەشە دەکات.

**ژیان فێری کردم:** مرۆڤ دەتوانێت خۆی بگۆڕێـت، هەروەها دەتوانێت هەر نەریتو هەڵسـوکەوتێك کە پێی خۆشە هەڵیبژێرێت، کەواتە ئەوە ڕاسـت نییە کـە دەڵێت: ئەو خـووەی فێری بوویت ناتوانیـت وازی لێبێنیـت، ئەم قسـەیە بەرهەمـی چەندین خـاوەن ئەزموونو کەسانی شارەزایە.

و: حسێن مەحمود هەڵەبجەیی

# بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانت

بەشی سێیەم

٥١- پەیمان مەدە بە منداڵەکەت بە پاداشتکردنیو پاشان پەیمانەکەت جێبەجێ نەکەیت.

٥٢- خەرجیو پارەی ڕۆژانە باشترە لە خەرجی مانگانە، تا منداڵەکەت بەیانیان بتوانێت بتبینێتو هەست بەوە بکات کە بە بەردەوامی پێویستی بە تۆ هەیە، چونکە خەرجی مانگانە هانی منداڵەکە دەدات زیادەڕەوی بکات لە خەرجکردنی پارەکەدا کاتێك لە پڕ بە کۆمەڵ وەریدەگرێت، هەروەها ناشزانێت بە باشی خەرجی بکاتو بەو شێوەیە بەشی مانگەکەی ناکات.

٥٣- ئاگاداری چیرۆکە خەیاڵییە ڕوخێنەرەکان بە.

٥٤- کاتێ قسە لەگەڵ منداڵەکانتدا دەکەیت، با سەیرکردنەکەت هەموویان بگرێتەوە.

٥٥- لە بەردەم خەڵکیدا لۆمەی منداڵەکانت مەکە.

٥٦- هەرگیز لە بەردەم منداڵەکانتدا لەگەڵ هاوڕێکەتدا، یان لەگەڵ هاوسەرەکەتدا ناکۆکی دروست مەکە.

٥٧- لە بارەی جیاوازیی ڕاوبۆچوونی زانایان قسە لەگەڵ منداڵەکانتدا مەکە.

٥٨- کاتێك منداڵەکەت قسە دەکات قسەکانی پێ مەبڕە.

٥٩- با منداڵەکەت تەنها لەگەڵ هاوڕێ چاکەکانیدا بڕواتە دەرەوە، تۆش دڵنیا دەبیت لێیان کە قسەو باسی خراپ ناکەن.

٦٠- تەماشای منداڵەکەت بکەو بگەڕێ بە دوای تواناکانیداو گەشەی پێبدەو هانی بدە لەسەریو ئەگەر حەزەکانیشی دیاریکراو نەبوو، ئەوە کارێك، یان وەرزشی بۆ پێشنیار بکە، تاوەکو خۆی تیادا ببینێتەوەو هەست بە کەمی نەکات.

٦١- منداڵەکەت فێربکە کە گیرفانی خاڵی نەبێت لە قورئانو قەڵەم و کاغەزو کلێنێکس.

٦٢- ڕاوێژ بە منداڵەکەت بکەو فێری ڕاوێژکردنی بکەو دووری خەرەوە لە دیکتاتۆرییەت.

٦٣- گەشەدان بە تواناو چالاکییەکانی منداڵ زۆر گرنگە، وازیان لێ بێنە خولو گەشت ڕێکبخەنو تۆش لە کاتی پێویستدا ئامۆژگارییان ئاراستە بکە.

٦٤- بیروهۆشی منداڵ تیژو ساتییەو بە خێرایی شتگەلێکی زۆر لەبەر دەکات بەبێ تێگەشتن لە ماناکانی، لەبەرئەوە بیقۆزەرەوە بۆ لەبەرکردنی قورئانو فەرموودەو نزاو دوعاو پاڕانەوەکان.

٦٥- منداڵەکەت دووربخەرەوە لە زمانی بیانی پێش تەمەنی ٦ ساڵی، چونکە ماوەی گەشەی خێرای زمانە، یان بە باشی شتەکان لەبەر دەکاتو لەزەت لە زمانەکەی دەبینێت، یان بە خراپی لەبەری دەکاتو ئەو کاتەش بێز لە زمانەکەی دەکاتەوە.

٦٦- پێویستە زمانی منداڵ پاراوو ڕەوان بکرێتو بە جوانی دانبنێت بە وشەکاندا.

٦٧- منداڵەکەت ڕابێنە کە تەنها ئەو یاریانە بکات کە سوودی لێ دەبینێت، وەکو شەترەنجو چوارگۆشەکانو یاری تر، با یاری بە دۆمینەو تاوڵەو وەرەقەو ئەو جۆرە شتانە نەکات.

٦٨- میزکردنی خۆنەویستانە لەوانەیە هۆکارەکەی لاوازی میزەڵان بێت، لە ئەنجامی بەدخۆراکی، لەوانەشە هۆکارەکەی ترس بێت، یان ئیرەیی، یان لاواندنەوەو نازپێدانی زۆر، یان توندوتیژی، یان بوونی ناتەواوییەك، یان زۆری هەستەوەری نەبوونی متمانە بەخۆو ئەو جۆرە شتانە،

بۆیە زۆر ئاگاداربە کە سزای منداڵەکەت نەدەیت، یان بەو هۆیەوە لۆمەی نەکەیت.

٦٩- منداڵەکەت لە تاریکی، یان دێوەزمە، یان شەولەبان، یان بە هەڕەشەی نابەجێ، یان بە پۆلیس مەترسێنە.

٧٠- لە بەردەم منداڵەکانتدا ترسی خۆت دەرمەخە لە تاریکی، یان لە ئاژەڵانی مەترسیدارو دڕندە.

٧١- ئاشنا ببە بە کێشە دەروونییەکانی منداڵەکەت لە لایەن پسپۆڕانەوە تاوەکو منداڵەکەتی لێ دووربخەیتەوە.

٧٢- بە باشی ئاگاداربە، چونکە منداڵ تەماشای تۆ دەکاتو هەوڵ دەدات لاساییت بکاتەوە لە ڕۆشتنتداو لە وەستانتداو لە قسەکردنتداو شێوازی دواندنت، لەبەرئەوە شێوازێکی باش بۆ خۆت هەڵبژێرە تا لێتەوە فێر ببێت، ئەگەرنا ئەوە تەنها لۆمەی خۆت بکە.

٧٣- پەروەردەکردن بەبێ پێشەنگی بوون، وەکو نووسینی سەر سەهۆڵ وایە، چونکە منداڵ قسەی لە بیر دەچێتەوە، بەڵام ڕەفتاری لە بیر ناچێتەوە، لەبەرئەوە هەمیشە سووربە لەسەر ئەوەی پێشەنگێکی باش بیت لە هەموو جوڵەو گوفتارو کردارێکتدا، چونکە منداڵ وەك ئاوێنە وایە کە تۆ خۆتی تیادا دەبینیت بۆیە تەماشا بکە بە چ شێوەیەك حەز دەکەیت خۆت ببینیت.

٧٤- دان بە هەڵەکانتدا بنێ، کاتێ لەبەردەم منداڵەکەتدا هەڵەیەك دەکەیتو پۆزش بهێنەرەوە، با هەڵەکەش سادە بێت.

٧٥- کۆنتڕۆڵی پەرچە کردار زۆ گرنگە لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵدا، بە تایبەتی لە کاتێکی کتوپڕدا لەسەر شتێك، یان لە کاتی پرسیارێکی چاوەڕوان نەکراودا.

٧٦- چیرۆكو سروود لەگەڵ دیاریو خەندەدا خێراترین ڕێگایە بۆ دڵی منداڵ.

٧٧- لە بەردەم هیچ کەسێکدا بەشانو باڵی منداڵدا هەڵمەدە، مەگەر بە مەبەستی هاندانو چاولێکردن.

٧٨- فێریان بکەنو توندوتیژ مەبن لەگەڵیاندا، چونکە ئەسڵ لەگەڵ منداڵدا نەرمونیانییە نەك توندوتیژی.

٧٩- پابەند بە، بەم یاسایەوە لەگەڵ منداڵەکانتدا: [بەهێزی بەبێ توندوتیژی، نەرمونیانی بەبێ لاوازی].

٨٠- چیرۆك گێڕانەوە لە ڕێگای کاسێتو سیدییەوە، زۆر گرنگە بۆ منداڵانی تەمەن بچووك.

# توڕە مەبە...

قاسم سروش

توڕە مەبە لە ژیان ، ژیان چاوەڕێی تۆیە، بگری بۆ خۆت، چیت کردووە بۆ ژیانی دونیاتو چەندە توڕە بوویت لە ژیانت؟

دوو گەنج پێکەوە دەڕۆیشتن بۆ ئەوەی بچن بۆ ئەو کارەی کە لە ئاگادارییەکە چاویان پێ کەوتبوو، هەر دوو گەنجەکە پێکەوە گەیشتن بۆ شوێنی مەبەست، تا کاربکەن...

بەڕێوەبەری کۆمپانیا کەسێکی هێمنو ژیرو لەسەر خۆبوو، شارەزایی باشی هەبوو لە هونەری ناسیندا، ئەو بەڕێوەبەرە تەنها پێویستی بە یەك کەس هەبوو بۆ کارەکەی، بۆیە بە پێویستی زانی یەکێك لەو دوو گەنجەی هاتبوون بۆ کارکردن تاقیان بکاتەوە، تا بزانێت کامەیان گونجاوترن بۆ کارەکەی ئەو.. ئەو دوو گەنجە ماوەی ٣ کاتژمێر مانەوە لە نووسینگەی چاوەڕوانی تا بچن بۆ لای بەڕێوەبەر، دواتر بەڕێوەبەر هەردووکیانی بانگ کردە ژوورەکەیو بێ ئەوەی داوایی لێبوردنیان لێ بکات پێی وتن: بڕۆن بەیانی وەرنەوە بۆ ئێرە تا بزانم کامەتان باشترن بۆ کارەکەم. یەکێك لە گەنجەکان زۆر توڕە بوو بە خاوەن کارەکەی وت: تۆ گاڵتە بە ئێمە دەکەیت لەبەرئەوەی ماوەی یەك کاتژمێر لە ڕێگا بووین، سێ کاتژمێریش چاوەڕوان بووین تا تۆ ببینین، تۆ بەم جۆرە پێشوازیمان لێ دەکەیت؟ بەم جۆرە هەردووکیان چوونەماڵەوە تا بەیانی بێنەوە بۆ کارکردن، بۆ بەیانی هەردوو گەنجەکە لای بەڕێوەبەر ئامادە بوون، خاوەنکار پرسی لێیان بۆچی دوێنی پێشوازی نەکردوون، هەر ئەو گەنجەی دوێنی کە زۆر توڕە بوو هەستایە سەرپێ، وتی: تۆ ئەی بەڕێوەبەر کەسێکی زۆر لە خۆ باییتو هیچ گرنگ نییە لای تۆ ئێمە کار بکەین، بەڵکو حەز دەکەیت لە چاوەڕوانی دامانێنیتو ماندوومان بکەیت.

بەڕێوەبەر لە گەنجەکەی تری پرسی: بۆچی تۆ هیچ کاردانەوەت نەبوو لەو کارەی من!!؟ گەنجەکە وەڵامی دایەوەو وتی: لەبەرئەوەی لە ئاگاداری بەڕێزتان نووسرا بوو کەسێکتان دەوێت (توڕە نەبێت)!! گەنجە توڕەکە سەری سوڕماو بە هێمنی وتی: من باوەڕناکەم شتی وا لە ئاگاداری کارەکە نووسرابێت، بۆیە بەڕێوبەرەکە ئاگادارییەکەی نیشان دا، لە خاڵی یەکەمی مەرجەکان نووسرا بوو: (کەسێکمان دەوێت توڕە نەبێت)!!

# ئامۆژگاری باوکێکی دانا بۆ کوڕەکەی

و: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

**کوڕە شیرینەکەم**

ئەگەر ویستت چاکسازی لە جیهاندا بکەیت لە خۆتەوە دەست پێبکە؟

بۆ ئەوەی وەکو پاشایەکی شکۆمەند لە ناو خەڵکدا دەرکەویت...

قسە لە شتێکدا مەکە... تەنها دوای دڵنیا بوون لەسەر چاوەکەی نەبێت..

ئەگەر کەسێك هەواڵێکی بۆ هێنایت، لێی وردبەرەوەو لە ڕاستی هەواڵەکە دڵنیابە، پێش ئەوەی بڵاوی بکەیتەوە...

ئامان ئاگاداری پروپاگەندەبە.. باوەڕ بە نیوەی ئەو شتانەی دەگوترێت مەکە نەوەك هەمووی...

**کوڕە شیرینەکەم**

ئەگەر خودا بە دووژمنێك تاقیکردیتەوە.. بەچاکە لەگەڵ کردن بەرەنگاری ببەرەوە... خراپەکان بەچاکە وەڵام بدەرەوە..

چونکە زۆرجار دوژمنایەتی دەگۆڕێت بە خۆشەویستی..

**کوڕە شیرینەکەم**

ئەگەر ویستت لە هاوڕێییەکت حاڵی بیت... سەفەری لەگەڵدا بکە... چونکە لە سەفەردا... مرۆڤەکان ئاشکرا دەبن.. ڕواڵەتەکان نامێنن.. ناوەڕۆك دەردەکەوێت! هەر بۆیەش سەفەر بە سەفەر ناونراوە!! لەبەرئەوەی سروشتو ئاکارەکانی مرۆڤ خۆیان ئاشکرا دەکەن!

**کوڕە شیرینەکەم**

ئەگەر خەڵکی هێرشیان کردە سەرت، لە کاتێکدا تۆ لەسەر حەق بوویت.. یان سەرزەنشتیان کردیت بە ڕەخنە لێگرتن.. دڵخۆش ببە..

چونکە ئەوان بە زمانی حاڵ پێت دەڵێن.. تۆ سەرکەوتوو و کاریگەری.. چونکە تەنها داری بەردار بەردەباران دەکرێت!

**کوڕە شیرینەکەم**

کاتێك ڕەخنە ئاراستەی کەسێك دەکەیت.. هەوڵ بدە بە چاوی هەنگ ببینی... هەوڵ مەدە بە چاوی مێش تەماشای خەڵك بکەیت... تەنها شتە خراپەکانیان ببینی!

**کوڕە شیرینەکەم**

زوو بخەوە... چونکە فەڕوو بەرەکەت لە ڕۆژی بەیانیندایە... دەترسم ڕۆژی خودات لە دەست بچێت... لەبەر درەنگ خەوتنی شەوانت!

**کوڕە شیرینەکەم**

ئێستا چیرۆکی گورگو بزنت بۆ دەگێڕمەوە، تاوەکو بێباك نەبیت لە خەڵکی فێڵباز...

هەرکاتێك کەسێك متمانەی پێت کرد، ئامان ئامان ستەمی لێنەکەیت!

ئێستا دەت بەم بۆ لای لانەی شێر... فێری ئەوەت دەکەم بۆچی شێر پاشای دارستانە.. چونکە ستەم ناکات! هەرچەندە برسی بێت... ناچێتە سەر نێچیری یەکێکی تر! لەبەرئەوەی دەروون بەرزە! بۆیە ئاگادار بە ماندوو بوونی کەسێکی تر نەدزیو ستەمی لێ بکەیت!

**کوڕە شیرینەکەم**

ئێستا دەت بەم بۆلای بزن مژۆك.. تاوەکو بە چاوی خۆت فرتو فێڵەکانی ببینی! چونکە بە گوێرەی شوێن ڕەنگی خۆی دەگۆڕێت.. بۆ ئەوەی دڵنیابیت لە شێوەی ئەدا... دووبارە دەبنەوە! چونکە لێرەدا دوو ڕوو هەن... خۆیان لە ناو هەموو بەرگێکدا دەشارنەوە!

لەپاڵ بانگەوازی چاکەدا... خۆیان دەشارنەوە!

**کوڕە شیرینەکەم**

فێری سوپاسگوزاری بە... سوپاسی پەروەردگارت بکە! بەسە بۆ تۆ کە دەتوانیت بڕۆیت... ببیستی... هەروەها ببینیت!

سوپاسی پەروەدگارت بکەو پاشان سوپاسی خەڵك... چونکە خودا نیعمەتەکانی بۆ سوپاسگوزاران زیاد دەکات!

هەروەها خەڵکی کەسێکیان خۆش دەوێت.. پێزانینیان هەیە بۆ ماندووبوونیان!

**کوڕە شیرینەکەم**

بۆم دەرکەوتووە... گەورەترین چاکە لە ژیاندا... ڕاستگۆییە! درۆ هەرچەندە

ڕزگاریشت بکات... ڕاستگۆیی باشترە! بۆ کەسانی وەکو تۆ!

**کوڕە شیرینەکەم**

بۆ هەموو شتێك بریکارێك بۆ خۆت دابنێ.... ئامادەبە بۆ هەموو کارێك! تاوەکو لە کەسانی نامەرد نەپارێیتەوە.. سەرشۆڕو زەلیل ببیت!

سوود لە هەموو هەوڵێك وەرگرە.. چونکە ئەو هەلەی ئێستا بۆت هەڵکەوتووە.. لەوانەیە دووبارە نەبێتەوە!!

**کوڕە شیرینەکەم**

سکاڵا مەکەو و بێزاری دەرمەبڕە... هەمیشە گەشبین بەو ڕوو لە ژیان بکە.. دۆستایەتی بێهیوایانو ڕەشبینان مەکە! ئامان لەگەڵ کەسانی خۆ بەگەورەزان دامەنیشە!!

**کوڕە شیرینەکەم**

بە کارەساتو بەڵاو ناخۆشییەکانی خەڵکی هەرگیز دڵخۆشو خۆشحاڵ مەبە... ئامان گاڵتە بە شێوەو ڕووخساری کەس مەکە.. چونکە مرۆڤ خۆی، خۆی دروستنەکردووە... بە گاڵتە پێکردنی تۆ... لە ڕاستیدا گاڵتەت بە خۆت کردووە!

**کوڕە شیرینەکەم**

کەم و کورتی خەڵك ئاشکرامەکە... چونکە خودا لە ماڵەکەی خۆتدا ڕسوات دەکات... خودا کەمو کورتی داپۆشەرە... داپۆشەرانی خۆش دەوێت! ستەم لە کەس مەکە... ئەگەر تواناکانت هانی دایت ستەم لە خەڵکی بکەیت... لە یادت نەچێ خودا لە هەمووکەس بە تواناترە!

**کوڕە شیرینەکەم**

ئەگەر هەرکاتێك هەستت بە دڵڕەقی کرد... دەستبەسەری منداڵێکی بێباوکدا بهێنە... ئەو کات تووشی سەرسوڕمان دەبیت... کە چۆن دەست بەسەرداهێنان دڵڕەقی دەسڕێتەوە... دەیشواتەوەو نایهێڵێت!

**کوڕە شیرینەکەم**

ئامان مشتومڕ مەکە.... چونکە لە مشتومڕدا.. هەردوولا زەرەرمەند دەبن! کاتێك ئێمە شکست دەهێنین، ئەوا شکۆمەندیمان لە دەست دەدەین!

بەڵام کاتێك سەرکەوتین ئەوا... کەسێکی ترمان بە دۆڕان داوە.. کەواتە هەموومان دۆڕاوین... ئەوەی سەرکەوتووەو... ئەوەش وا گومان دەبات دۆڕاوە!

**کوڕە شیرینەکەم**

تاك ڕەو مەبە لە دەربڕینی ڕا دا... چونکە وا جوانە کاریگەربیو کاریگەریشت لەسەرهەبێ! بەڵام ئامان لە ناو ڕای خەڵکیدا نەتوێیتەوە، ئەگەر هەستت کرد ڕای تۆ لە سەر حەقە... ڕاکەت نەگۆڕیو کاریگەری کەست بەسەرەوە نەبێت!

**کوڕە شیرینەکەم**

دەتوانی بیروڕای خەڵك بگۆڕیت... هەروەها دەتوانیت دەست بەسەر دڵی خەڵکیدا بگری بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن! نەك بە جادووگەریو فێڵ لێکردن.. زەردەخەنەکەتو.. گوفتارە شیرینەکەت... بە هۆی ئەوانەوە دەتوانیت شەیدای خۆتیان بکەیت!

زەردەخەنە بکە... پاكو بێگەردی بۆ ئەو کەسەی کە لە دینی ئێمەدا...(عیبادەتە)و لەسەری پاداشت وەردەگرینەوە!

لە (چین) دا ئەگەر زەردەخەنەت نەبێت ڕێگای بازرگانی کردنت پێنادەن.. ئەگەر کەست نە دۆزییەوە زەردەخەنەت پێشکەش بکات... تۆ زەردەخەنەیان پێشکەش بکە! ئەگەر دەزانیت کە نێوانەکان بە زەردەخەنە نامێنن... بە خێرایی... دڵەکانت بۆ ڕادەربڕین بۆ دەکاتەوە!!

**کوڕە شیرینەکەم**

هەرکاتێك گومانت لەسەر دروست بوو لە لای خەڵك... بەرگری لە خۆت بکە... ڕوونکردنەوە بدە... بەڵگەیان پیشانبدە! دەستمەخەرە کاری خەڵكو خۆت لە کاری خەڵکی هەڵمەقورتێنە..

**کوڕە شیرینەکەم**

دڵتەنگ مەبە بەوەی لە ژیان بەسەرت دێت! چونکە تەنها بۆ تاقیکردنەوە دروستکراوین.. هەتاکو خودا بمانبینێت.. ئایا ئارام دەگرین؟!

بۆیە لەسەرخۆبە... لێڵ مەبە! دڵنیابە دەروکرانەوە نزیکە... ئەگەر تاریکی هەورەکان زیادی کرد... ئەوا باران بارین نزیك بووەتەوە!!

**کوڕە شیرینەکەم**

بۆ ڕابردوو مەگریی.. ئەوەندە بەسە کە ڕۆیشتووە..

گاڵتە جارییە ئاردەدار هەڵبگرینەوەو پەرش و بڵاوی بکەینەوە!!

چاوەڕوانی بەیانی بە.. ئامادەبە... گەرم وگوڕو چالاك بە!!

کەواتە بەهێز بە.. سەربەرز بە!

چونکە چۆن تەماشای خۆت بکەیت، خەڵکی ئاوات دەبینن...

تەنها خۆتی بڕیاری بچووکی خۆت دەدەیت!

و: ڕێبوار ئەحمەد شەقڵاوە

چوار شت جەستە دادەڕمێنن: خەم، دڵ پەستی، شەونخوونی، برسێتی...

چوار شت جەستە خۆشحاڵ دەکەن: بینینی گوڵشەنی جوان، بینینی ئاوی جۆگەو ڕووباران، بینینی دۆستانو خۆشەویستان، لەگەڵ بەروبوومی درەختانی سەوز.

چوار شت جەستە نەخۆش دەکەن: قسەی زۆر، خەوتنی زۆر، خواردنی زۆر، جووتبوونی زۆر.

چواریشیان جەستە بەهێز دەکەن: پۆشینی بەرگی نەرم، خۆشۆردن لەگەرماوێکی مامناوەندی، خواردنی خۆراکی شیرینو چەور، بۆنکردنی بۆنی خۆش.

چواریش جوانیو ڕۆشنایی بزردەکەن: درۆکردن، بێ ئابڕویی، زۆرپرسیارکردنی بێ هودە، زۆرخراپەو تاوانکردن.

چواری تریش ڕووخسار گەشو ڕووسوردەکەن: جوامێری، وەفاداری، بەخشندەیی، تەقواکردن.

چواریشیان ڕقوقین دروست دەکەن: خۆ بەزلزانین، چاوگێڕان، درۆزنی، ئاشوب گێڕی.

چواری دیکەش ڕزقو ڕۆزی ڕادەکێشن: شەوبێداری بۆ نوێژکردن، لەپێش بەرەبەیان زۆر وتنی {أستغفرالله}، لەسەر ماڵبەخشین ڕاهاتن، لە سەرەتاو کۆتایی ڕۆژدا پاڕانەوەو نزاکردن.

چواری تر ڕێگە لە ڕۆزی دەگرن: کەم نوێژی، خەوی بەیانی، ناپاکی، لەشگرانی.

بەڵام ئاگاداربە ئەم چوارینەیە مرۆڤ بیربڕو بیر تیژ دەکەن: دڵ گوشادی، کەم خواردنەوەو کەمخۆری، جوان ڕێکخستنی خواردنی شیرینی و چەوری، فڕێدانی ئەو پیساییەی بۆ جەستە بۆتە مایەی بارگرانی.

سەرچاوە: لاتحزن.

# با منداڵەکانمان خۆیان بەدوای وەڵامی پرسیارەکاندا بگەڕێن

و: سۆران کانیپانکەیی

منـــداڵ ئەو بوونەوەرە بچکۆلانەیە کە ڕۆحێکی بێگەردو مێشـــکێکی سافو دوور لە خەموپەژارەی هەیە، بەردەوام گومانیان لە شتەکانی دەورووبەریان هەیەو هەمیشە لە نێو دوو دڵیدان؟

ئەو جیهانەی ئەوانی تێدایە، بێگومان دوورە لە پەشێویو ماندووبوونو سەرقاڵی ژیـــان، بۆیە ئـــەوان هەردەم لە شـــتەکان دەکۆڵنەوەو گومانو دوودڵییەکانیان تاقی دەکەنەوە.

ئەو ژینگەی کـــە دەبێت بۆ ئەو بێتە دی، تـــا لـــە ئاینـــدەدا ســـەرکەوتوو بێت، ژینگەیەکـــە کـــە دەبێـــت ئازادانـــە بیری تیابکاتەوە.

کەشـــێکی ئازادیـــان پـــێ بدرێـــت تـــا بتوانن هەم بپرســـن، هەم بەدوای وەڵامی پرســـەکەیاندا وێڵبـــن، بگەڕێـــن بـــۆی تا ماندووبنو بۆ دواجار بە دەستی بێنن؟

بۆ دروستکردنی وەها ژینگەیەك دەبێت هەندێك ڕێگە بگیرێتەبەر، لەوانە:

-بردنیـــان بـــۆ شـــوێنە جیاجیاکانی دەوروبـــەرو دووبارەکردنـــەوەی ئـــەو گەڕانـــە، کڕینـــی یـــاری گونجـــاو بۆیان، هەریەك لەمانـــە کاریگەری تەواوی هەیە لەســـەر گەورەبوونو فراوانبوونی مێشکو جوڵاندنی هزرو بیریان.

- ڕێگە بدەن تـــا منداڵەکان هەندێك لـــە کارەکان بۆخۆیـــان ئەنجامـــی بـــدەن، بەو شـــێوەیە دەتوانن هەمیشە کاری نوێ ئەنجام بدەن.

- بهێڵـــن لەگـــەڵ هەنـــدێ بابەتـــی نوێـــدا ڕووبـــەڕوو ببنەوە بۆ ئـــەوەی لە گەورەبوونیو کاتی پێگەیشتنی توانایەکی باشو هزرێکی بەهێزی هەبێت.

- کاتێك منداڵ پرســـیارێك دەکات با خێرا وەڵامی نەدرێتەوە، بەڵکو هان بدرێت خـــۆی بە دوای وەڵامەکەیـــدا بگەڕێت، لە مێشـــکی خۆیدا بیری لـــێ بکاتەوە، ڕەنگە ئـــەو کات بە وەڵامێك بـــگات، یا لانی کەم نزیکی بکاتەوە لە وەڵامەکە.

- گەربێـــتو لە منداڵییـــەوە تا کاتی گەورەبوونی وەڵامی گشـــت پرســـیارەکانی بدرێتـــەوە، بێگومان هێـــزی بیرکردنەوەو بەدیهێنانـــی لاوازو کز دەبێت، توانای پەی پێبردن، داهێنانو ئەنجامگیری لە دەســـت دەدات.

- زۆرێـــك لە دایکانو بـــاوکان کاتێك وەڵامی هەموو داخوازیو پرسی نەوەکانیان دەدەنەوە بەو ئومێـــدەی هزریان والابێت، واش هەست دەکەن کە هێزی بیرکردنەوەو توانای هزرییان پـــێ دەدەن، بەڵام نەخێر چـــون کاتێـــك کـــە پێگەشـــت دەزانن کە ئـــەو کات ناتوانـــن وەڵامێکی دروســـت بۆ پرســـیارەکان هەڵبژێـــرن، لەبەرئەوەی کە پێـــی وتراوەو هـــەوڵو تەقەلای مێشـــکی نەبووە بۆ وەڵامەکە.

- جا لە بری ئەوەی هاوکاری بکەیتو وەڵامی پرســـیارەکانی بدەیتەوە، هەوڵبدە ژینگەیەکـــی بۆ فەراهەم بهێنە تا بۆ خۆی بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارەدا بگەڕێ کە بۆی دروست بووە.

دەبینـــی کـــە وەڵامێـــك لە مێشـــکیدا گەڵاڵە دەبێت.

جان جاك ڕۆسۆ دەڵێ: منداڵ سروشتی خۆی بە تواناو کارایە، خۆی پەی بەشتەکان دەبات، بە مەرجێك ڕێگری لێ نەکرێت.

ئێمـــە گـــەر بێـــتو پێیـــان بڵێین: چ نەخشـــەیەك لە دەفتەرەکەیاندا بکێشـــنو کامـــە ڕەنگی لێبـــدەن، بێگومـــان ئازادی بیرکردنەوەیمـــان دیل کـــردووەو کۆتمان کردووەتە مێشکی.

گـــەر ڕێگە بدەیـــن سروشـــت ببینن، شوێنە جۆراو جۆرەکان تەماشابکەن، یاری شـــیاوو خوێندنەوەی شـــیاویان پێبدرێت، هۆکارێکـــی باش دەبێت بۆ وەگەڕخســـتنی بیری منداڵ.

منـــداڵان بۆئەوەی پەی بە شـــتەکانو وەڵامە نادیارو ئەســـتەمەکانی بەردەمیان بەرن، پێویستیان بە تاقیکارییەکی تایبەت هەیە. ئێمە تەنهـــا هاوکارییان دەکەین تا بۆ خۆیان بەدوای وەڵامەکاندا بگەڕێن.

ئا: بێگەرد فارس

# خاوەنی ڕووبەرێك بە لە ژیان!

پاش ئەوەی زانی توشی نەخۆشی بووەو ساتەکانی تەمەنی‌و مۆمی ژیانی بەرەو خامۆش بوون دەچێت، ڕۆماننوس (گابریل مارکیز) لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنییەکەی پەیامێکی ئاڕاستەی خوێنەرانی کردو تیایدا نووسی: «خۆزگە خوای گەورە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت ژیانی پێ ببەخشیمایەتەوە، بۆ ئەوەی بەخۆشی بەسەری بەرم، زیاتر لەوەی کە بەدرێژایی تەمەنم بەڕێم کردووە، زۆر کەم دەخەوتم تەنها خۆشیم لە خەونەکانمدا بەسەر دەبرد.. گوڵەکانم بە فرمێسکەکانم دەشوشت‌و هەموو ڕق‌و کینەم لەسەر پارچەیەك سەهۆڵ دەنووسی‌و چاوەڕێی خۆرم دەکرد تا بیتوێنێتەوە، هەموو کەسێکم خۆش دەویست‌و هیچ ڕۆژێکم تێ نەدەپەڕاند، هەتا پێیان ڕابگەیەنم کە چەندە خۆشم دەوێن‌و باشترین کەسی منن!»

ئەوە ئامۆژگاری کەسێکە لە لێواری مردندایە ئاوات دەخوازێت بگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو تا بە شێکی تر لە ژیان دەستبخات بۆ ئەوەی تام‌وچێژی لێ وەربگرێت، تا ئەو کاتەی لە ژیاندایە.

من لە تۆم دەوێ بە ڕوونی ژیان‌و ئەوەی لەبەر دەستتدایە ببینی بۆ ئەوەی بتوانی زۆر شتی تێدا ئەنجام بدەیت.

ئێستە داوات لێ دەکەم پەڕاوێك‌و پێنووسێك ئامادە بکە، دەست بکە بە نووسینی ئەوەی کە لە داهاتوودا دەبێت چیت کردبێ‌و ئامادەت کردبێ بۆ دوای خۆت؟

لەوانەیە پرسیارێکی گران بێت، بەڵام ئامانجێکی گرنگی تێدا هەیە...

گابریل مارکیز ڕۆڵی کەسێك دەبینێت لەسەرە مەرگدایە، چونکە لەو کاتەدا هەموو کەسێك بیر لە ساتەکانی ژیانی دەکاتەوە کە بێ ئەوەی شتێك بۆ ژیان‌و دوای ژیانی پێشکەش کردبێ.. ئەو کاتەش پەشیمانی دایدەگرێت‌و ئاهو حەسرەت هەڵدەکێشێ.

کاتێك داوات لێ دەکەم کە دەست بە نووسین بکەو ئەوەی بۆ داهاتوو دەتەوێت بە ڕوونی دیاری بکە.

زۆرترین سوود وەرگرتن لە ئەزموون‌و شارەزایی کەسانی تر، یان کردنی کەمترینی هەڵەکان‌و دووبارە نەکردنەوەیان...

کەمێك تێڕامێنەو بیربکەرەوە منداڵەکانت پاش (٣٠) ساڵی تر بیانەوێت لە بارەی ژیانت بنووسن، پێت خۆشە چی بنووسن؟

تەنها ناوەکەت دەنووسن؟ چونکە هیچ تایبەتمەندییەکت نەبووە لە ژیاندا؟

یان جوانترین دەربڕین لە پاڵ ناوەکەت دەنووسن، بە باشترین بەخێوکەر، سەرکردەیەکی هاوڕێ، پەروەردەکارێکی دڵسۆز... هتد).

ژیان بەجێ مەهێڵە هەروەك ئەوەی کە سەرەتا چوویتە ناوی بێ زیادکردنی هیچ شتێك کە شایانی باس بێت.

ئەحمەد شەوقی دەڵێت: کەسێك بە ئەگەر پاش تۆ کەسانی تر هاتن هەست بە جێ دەستت بکەن...

ئایا چ شتێکت دوای خۆت جێ هێشتووە کە ئاماژە بە خۆت‌و کارەکانت بکات؟

چەند ئەستەمە کەسێك گەشتێك بە ڕابردوویدا بکات، بەڵام نەتوانێت هیچ دەستکەوتێك، یان کارێك بەدی بکات کە لە ماوەی ژیانیدا بەسەری بردبێت.

خوێنەری ئازیز ئێستە پەڕەیەکی سپی ئامادە بکەو لە خوای گەورە داوای تەمەنێکی پڕ کردەوەی باش‌و هەوڵ‌و تێکۆشان بکە لە پێناو هێنانەدی ئامانجێك کە ڕەزامەندی خوای گەورەو بەختەوەری خۆت‌و کۆمەڵگەکەت بێت.

پەیمان بدە کە پەیامێك پێشکەش بکەیت تا پاش مردنیشت بە نەمری بمێنێتەوە.

پێش ئەوەی بە ڕێگەیەکدا بڕۆیت بۆ کۆتایی ڕێگەکە بڕوانە... هەڵێك بدە بە خۆت کە تیایدا داهاتوویەکی نموونەیی بە ڕوونی لەبەردەمتدا ببینیت.

محەممەد کلای دەڵێت: «هەرکەسێك جیهان ببینێت لە تەمەنی ٥٠ ساڵیدا، بە هەمان ئەو بینینەی لە ٢٠ ساڵیدا هاویەك بێت، ئەوا ٣٠ ساڵی تەمەنی لە دەستچووە!»

کەواتە بۆ ئەوەی کەسێکی زیادەی سەرزەوی نەبیت، شتێك لەسەر زەوی زیاد بکە.

سەرچاوە/ سوود لەم کتێبە (أفكار صغيرة لحياة كبيرة) وەرگیراوە.

# نهێنییەکانی هاوسەرداری

و: ڕێڤان عەلی

حەز دەکەیت نهێنییە نەوتراوەکان بزانیت؟ حەز دەکەیت هزری ئێوە بۆ شتانێك کە پێویستە بیزانیت، بە دەست بهێنیت؟

زۆرێك لە خانمان، پەیوەندی ژیانی هاوسەرداری خۆیان، بە گرفت ناخۆش دەکەن. لە کاتێکدا نزیکەی هەموو ئەوانە، سەبارەت بە مێردەکانیان، سەرنجێکی زۆر پیشان دەدەن، یان تەنانەت ڕەنگە بە خاتری پەیوەندییەکی فراوان بەوان، خۆبەختکردنێکی سەیرو سەمەرەیان لە ژیاندا هەبێت، لەسەر قاڵبوون بە پیشەکەیانو تەنانەت خووە کۆنەکانی خۆیان، چاوپۆشی دەکەن.. لە جێگای ئەوەی مێردەکانیان لە خۆیان نزیك بکەنەوە، لە دەستیان هەڵدێن.. بۆچی؟ لەبەر چەند هۆکارێکی زۆر سادە! کە لێرەدا بە پێی توانا هەندێکیان دەخەینەڕوو:

١- لە هەمان سەرەتاکانی ژیانی هاوسەرداری، هەوڵ مەدەن زۆر خۆتان وا پیشان بدەن.. کە پێویستتان بە مێردەکانتانە.. لە لایەکی دیکەشەوە، زۆر ئەو شێوە میهرەبانییە کەسێتییەی هەتانە پیشانی مەدەن.. بکەونە بیری ئەو منداڵە بچووکانەی هەمیشە حەزدەکەن، ئەو شتانەی پێیان دەدرێت، خۆیان بیکەنەوە، تا بە ئامادەکراوی پێیان بدرێت.

٢- لە هەر بارەیەکەوە، ئەو شتانەی حەزت لێیەتی باسیان بکە، چ جۆرە مۆزیکێك هەڵدەبژێریت؟ حەزت لە چ تامێکی بەستەنییە؟ بەڵام لەبارەی نهێنی کارەکانتان، چ گرفتێك بوونی هەیە؟ زۆر دەدوێن بۆ ئەوەی مێردەکانتان دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە، حەز دەکەن پشوویەك بدەنو گوێ لە بۆچوونەکانتان بگرنو قسەی خۆیان بکەن.. بەڵام دڵنیابن حەزی گوێگرتنی بۆڵەبۆڵ و گلەییو گازندەو گرفتەکانی ئێوەیان نییە. زۆر زوو ماندوو دەبنو تاقەتیان بەسەر دەچێت.. ئەو کات تۆ وەك ژنێکی نائومێدو ڕاڕا دێیتە بەرچاوی..

٣- سەبارەت بە ترسو نیگەرانییەکانتان قسە مەکەن. بۆ نموونە: ئەگەر گومانتان لە مێردەکانتان هەیە، پێی مەڵێن.. چونکە ئەو هەموو کارێك دەکات، تا پێچەوانەی ئەم خاڵە بە ئێوە بسەلمێنێت. هەوڵ بدەن، ڕازی بکەن.. هەموو شتێك ڕووبەڕووەو هەر جووڵەیەکی ئەو بەسەرنجەوە، لە ژێر چا ودێریتدا بێت. پاش ئەم خاڵە بیربکەنەوە.. ئایا لە ڕاستیدا، ئەم کەسە بەشێوەیەکی گونجاو، لەگەڵ مەبەستەکانی ئێوەدا هەڵسوکەوت دەکات یان نا، ئەگەر خۆتان بەم شێوە چاوەڕوانکراوە پیشاندا.. لە ڕاستیدا متمانە بە خۆتان دەبەخشن، ئەگەر خۆتان خۆش نەوێت.. هەرگیز ناتوانن بۆچوونی کەسی بەرامبەرتان، بە دەست بهێنن.

٤- ئەگەر لە سەرەتاکانی ڕووبەڕووبوونەوەدا، مێردەکانتان بە خراپی مامەڵەیان کرد.. کەسێکی دەم بە گلەییو سکاڵاکار مەبە، خۆی زۆر زوو تێ دەگات کە هەڵەبووە.. بێ ئەوەی تەنانەت ئاماژەیەکیش بکەیت، بە ڕەفتاری خۆیدا بچێتەوە.

٥- گرنگترین خاڵ ئەوەیە.. هەر لەسەرەتاوە زۆر خۆتان سوپاسگوزاری لایەنی بەرامبەر، پیشان مەدەن، بۆ لە خۆبایی بوونی ئەوان، وا باشترە تا دەتوانن لە خۆتان دڵنیا بن.

٦- هەموو شتێك زۆر زوو مەدرکێننو هەموو نهێنییەکانیشتان ئاشکرا مەکەن. هێواش هێواش بۆ پێشەوە بڕۆن. هەمیشە ئەو شتانەی بیری لێ دەکەنەوە، با بە زمانتاندا نەیەت.. کارێك بکەن مێردەکانتان، بۆ ئاشکراکردنی نهێنییەکانتان، بێئارامی پیشان بدەن.

٧- لە بۆڵە بۆڵ و بابەتی تەممەڵی ئەو بە ئاگا بە. ڕاستو ڕێك مەڵێ کە ئێوە بۆ هیچ جێگایەك نابات.. هیچتان لێیان نەوێت، چونکە زۆر زوو مێردەکانتان لە خۆیان دەپرسن، چۆن ئێوە هیچ شتێکتان لەو ناوێتو دەیەوێت سەرنجی ئێوە لەم بارەیەوە بە دەست بهێنن.. گەشتێك، یان لانی کەم، خوانێکی ئێوارەتان بۆ ئامادە دەکات.

٨- لەگەڵ ئەوەی لەوت ویستووە، هیچ کارێکی ناوماڵ ئەنجام نادات.. ئیدی لەم بارەیەوە مەدوێنو خۆتان وا پیشان بدەن دەتوانن بە تەنها کارەکانتان ئەنجام بدەن. خۆتان سەربەخۆ پیشان بدەن.. پیاوان لەم تایبەتمەندییەی ژنان خۆشییان دێ، هەرچەندە بە ڕووی خۆیاندا ناهێنن. هیچ کات وا خۆتان پیشان مەدەن.. زۆر پێویستتان بە هاوکاریو وابەستەیی ئەوانە.. خۆیان زۆر زوو بڕیار دەدەن، لە هەر بوارێکدا هاوکاریتان بکەن.

٩- هەمیشە لە بیرت بێ.. پیاوان ئەو ژنانەیان خۆش دەوێت، کە متمانە بە خۆبوونیان لە ئاستێکی باڵادایەو لە کردارو ڕەفتارەکانی خۆیاندا ئەم بابەتە پیشان دەدەن. بەم کارە کەسێتی لە پەیوەندییەکی دڵخۆشکەرو تەندروستدا ڕا دەگرێت.

سەرچاوە/ زندگی من

ئالانی

# گەر ناتوانیت پەڕی باڵندەکان کۆ بکەیتەوە، زمانت بگرە!

ڕۆژێکیان جووتیارێك لەگەڵ یەکێك لە هاونشینانی گوندەکەی بوویە دەمەقاڵەیان، جووتیارەکە قسەی ناشیرینو نابەجێو ناخۆشی بە دراوسێکەی گوت، بەڵام دراوسێکەی ئارامی گرتو وەڵامی نەدایەوە، کاکی جووتیاریش دوای ئەو هەراو دەنگە دەنگ و قسە پێ وتنە، گەڕایەوە ماڵ، پاش ئەوەی کەمێك پشوویداو ماندوویەتی نەما، هێور بوویەوەو بیری لەو قسە ناخۆشو نابەجێیانە کردەوە، کە بە دراوسێکەی وتووە، بە خۆی گوت: ئەوە من چیم بە سەرهاتووە؟ چۆن ئەو هەموو قسە ناشیرینە لە زاری من دەرچوو؟ زۆر پەشیمان بوو، خەم دایگرت، تەنها کارێك لەم کاتەدا لە دەستی بێت بۆ هێوربوونەوەی دەروونیو ئاسوودەیی ویژدانی، ئەوەیە بچێت بۆ ماڵی دراوسێکەیانو داوای لێبوردنی لێ بکات، هەر بۆیە بە خێرایی هەستاو ڕۆیشت بۆ ماڵی دراوسێکەی، بە شەرمەزارییەوە وتی: من زۆر داوای لێبوردن دەکەم، بۆ ئەو قسانەی بە بەڕێزتم گوت، لە ڕاستیدا خۆم بە شەرمەزار دەزانم، تکا دەکەم لێم ببورە، دراوسێکەشم زۆر بە دڵپاکانە داوای لێبوردنەکەی لێ قبوڵ کردم، لەگەڵ ئەوەشدا باری دەروونیم ئاڵۆز بوو، زۆر نیگەران بووم، بەو ڕەفتارەی بەرامبەر بە دراوسێکەم ئەنجامم دا.

بەردەوام بە خۆمم دەگوت: چۆن ئەو قسە ناشیرینانە لە زاری منەوە دەرچوو؟

جووتیارەکە ئارامی لێ هەڵگیرابوو، کردارەکەی زۆر پێ ناخۆشبوو، سەرەڕای ئەوەش کە دراوسێکەی داوای لێبوردنەکەی لێ قبوڵ کردبوو، بۆ ئەم مەبەستە ڕۆیشت بۆ لای دەم سپی ئاواییەکەو دانی بە تاوانەکەیدا ناو، پێی گوت: دەمەوێت دەروونم ئاسوودە بێت، من زۆر نیگەرانم بەو بوختانو قسە ناشیرینانەی بە دراوسێکەمم وتووە!

دەمسپی ئاواییەکە پیاوێکی ژیرو دنیا دیدە بوو، بە تەنگ گرفتەکانی گوند نشینەکانەوە بوو، پێی گوت: گەر دەتەوێت دەروونت ئاسوودە بێت بڕۆ تورەکەیەك پەڕی باڵندە کۆبکەرەوە، پاشان لە بەردەم هەر ماڵێکی ئەم گوندەدا پەڕێك دابنێ!

جووتیارەکە بی سێو دوو دەستبەجێ هەستا بە جێبەجێکردنی ئەو فەرمانە.

تورەکەیەك پەڕی باڵندەی کۆکردەوەو بەو شێوەیەی پێی وترابوو، لە بەردەم هەر ماڵێکی گوندەکەدا پەڕێکی دانا، پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵی دەمسپی ئاواییەکەو پێی گوت: ئەوەی وتت جێبەجێم کرد.

دەمسپییەکەش وتی: زۆرباشە، ئێستا بڕۆ هەموو پەڕەکان کە لە بەردەمی دەرگای ماڵەکاندا داتناوە، کۆیان بکەرەوە.

جووتیارەکە نەیپرسی بۆچی ئەم کارە بکەم، بەڵکو گوێڕایەڵانە ڕۆیشت بۆ کۆکردنەوەی پەڕی باڵندەکان، بەڵام بە داخەوە کاتێك دەچووە بەردەم هەر دەرگایەك، دەیبینی پەڕەکە با بردوویەتی، تەنها ژمارەیەکی زۆر کەمی لە پەڕەکان دەستکەوتەوە، بۆیە بە خەمباری گەڕایەوە بۆ لای دەمسپی ئاواییەکەو پێی گوت: پەڕی باڵندەکان با بردوویەتیو تەنها کەمێك لە پەڕەکان لە جێگەی خۆیان مابوون!

دەمسپی ژیرو دنیا دیدەش پێی گوت: کوڕی خۆم هەر قسەیەك لە زاری ئێمە دەردەچێت، وەکو ئەو پەڕە باڵندەیە وایە کە لە بەردەمی ماڵی هەر یەك لە براکانت داتنابوو، دەبینیت دانانی ئەم پەڕانە چەند ئاسان بوو؟!

بەڵام چەند قورسو گرانە گێڕانەوەی وشەکانمان بۆ نێو دەممان!!

کەواتە پێویستە لەسەرت، یان پەڕی باڵندە کۆبکەیتەوە، یاخود زمانت بگرەو ئاگاداریبە، مەهێڵە وتەی نابەجێو ناشیرین لێوەی بێتە دەرەوە.

سەرچاوە: أفكار صغيرة لحياة كبيرة

# ئێستا نە زووە، نە درەنگە!

سەروەر حەسەن

دەستەواژەی ناونیشانی ئەم بابەتە سەرنجی ڕاکێشام کە لەسەر دیوارێك بە خەتێکی جوان نووسرابوو، من لە ناو پاسدا بووم. لەوەدا بووم لە میانەی مانای دەستەواژەکەوە بڕۆمەوە نێو ڕابردوو، ئەو هەموو بڕیارانەی خۆمو نزیکو هاوڕێکانم کە بە بیانووی هێشتا زووەو جارێ کاتی نەهاتووە، بێنمەوە یاد، لەگەڵ ئەو سوودە زۆرانەی لە دەستمان چوونو ئێستا لێیان بێبەشین، بەڵام «بێزەحمەت ئەو پارەیە بگەیەنە» بیرکردنەوەکانی لێتێکدام.

دوای دابەزینم لە پاسەکەو لە ماڵەوەو کاتی نانخواردنو نووستنو کاتی دەوامو تا ئێستاش هەر دێتەوە یادم، بڕیارمداوە ئیتر بڕیارەکانمو کارکردنم بۆ جێبەجێکردنیان دوانەخەم.

هاوڕێیەکم هەبوو هێشتا نیوەی ساڵی خوێندنی جاران نەهاتبوو دەیگوت: «تازە درەنگە بۆ سەعیکردن، وا ساڵ تەواو بوو»، یەکێکی تر دەیگوت: «ڕێك لە شەممەوە دەست بە نوێژکردن دەکەم»، «هێشتا تەمەن زۆری ماوە، پەلەپەلی چیتە»، ئەوی دی: «سبەینێ تەلەفۆنی بۆ دەکەم»، کەسێکی دی: «ژیان هەلە، ئەو هەلەت نەقۆستەوە ئیتر تەواو»، هاوڕێیەکی دیکە: «خۆزگە پێرار ئەو کارەم بکردایە، ئێستا ئەزموونی دوو ساڵم دەبوو»... خۆم زۆرجار بە هەردوو پاساوەکە کارم نەکردووە، بۆ هەندێکیان وتومە: «هێشتا زووە بۆ من»و بۆ هەندێکیشان بیانووەکەم تێپەڕینی کاتەکەی بووە.

ڕاستە کاتی هەندێك کار دیاریکراوە، بەڵام هەموو ساتێکیش بۆ دەستپێکردن زوو نییەو کاتەکەشی بەسەرنەچووە، بە تایبەت کاری گۆڕانکاری لە هزرو ڕەفتاردا.

دەستخستنە ژێر چەناگەو «دۆش دامان!» بەدیار ڕابردووەوە ئێستاش دەکاتە ڕابردوویەك کە دەبێت لە داهاتوودا خەمی بۆ بخۆین کە ئەوکاتە بووەتە داهاتوو، دەبێ هەموو ڕابردوو تەنها وەك ئەزموون تەماشا بکرێت، نەك شکست، (بۆ ئەو کارانەی تیایاندا سەرکەتوو نەبووین)، یان تەممەڵی (بۆ ئەو کارو بڕیارانەی دوامانخستوون).

زۆربەی مرۆڤە مەزنەکان هەنگاوی سەرەتایان قورسو ناڕەحەت بووەو دەیانو دەیان ئاستەنگیان تێپەڕاندووەو گوێی خۆیان لە تانەوتەشەرو وتە ڕوخێنەرەکان خەواندووەو دەستیان پێکردووە. ژیاننامەی کەسە مەزنو دیارەکانی دونیا لە ڕابردوو و ئێستاشدا پڕیەتی لە سادەییو لێوانە لە بڕیاری گەورەو کۆڵنەدانو بێ ئومێد نەبوون.

دوای ئەزموون تێگەیشتم کە ئیشی ئەم ساتە لەم ساتەی خۆیدا بکەم، چونکە ساتی دواتر کاری خۆی تێدا هەیەو دوای ئەویش بە هەمان شێوە. ئێستا دەمەوێت بچم بۆ لای هاوڕێکەمو پێکەوە پیاسە، یان دەمەتەقێیەك بکەین، دێتە بیرم ئەو بەلوعەیە بگۆڕم کە واشەرەکەی خراپ بووە، ئارەزوو دەکەم تەلەفۆن بۆ هاوسەرەکەم بکەمو پێی بڵێم: «خۆشم دەوێیت»، هەنووکە پێویستە بچمە سەر کار، دەمێکە خاڵم گلەییم لێدەکات، دەبێت سەردانی بکەم، دەخوازم دەست بە نووسینی ئەم بابەتە، یان وەرگێڕانی ئەو کتێبە بکەم، هەر ئا ئێستا بچم دەستی چرچبوو و دڵی پڕ لە سۆزی دایکمو دەستە زبرو قڵیشاوو هەستە پڕ دڵسۆزییەکەی باوکم ماچ بکەمو تێر بیانلاوێنمەوە، لە دڵەوە حەزدەکەم دەستەکانم بەرزبکەمەوەو پڕ بە دڵ لەخوا بپاڕێمەوە، دەمەوێت بچمە نێو باخو تەماشای گوڵوگوڵزار بکەمو پڕ بە سییەکانم هەناسەی پاك هەڵبمژمو لەگەڵ هەناسەدانەوەمدا هەرچی ماندوویيو بێزاریو خەمە هەمووی لەجەستەم دەربکەم... کە ئێستا دەمەوێتو پێویستەو دەخوازمو حەزدەکەمو ئارەزوو دەکەم ئەو کارە بکەم، دەیکەم، هەر دەبێت بیکەم.

ئەگەر دوای خوێندنەوەی ئەم بابەتە هەستدەکەیت دەبێت ئەم نەریتە لە خۆتدا بئافرێنیت، هەر ئێستا بڕیاربدە، بڕیاربدەو خۆتی لەسەر ڕابێنە... ئەگەر بمانەوێت دڵنیابە هەر هەموومان دەتوانین.

هەستە ئەو کارە بکە کە لەخوێندنەوەی ئەم بابەتەوە هاتە خەیاڵتەوە، مەیخەرە کاتێکی تر.

# پەیامێك بە بێدەنگی!

ن: د. عبدالله صالح
و: محەممەد عەبدوڵڵا مێرگەیی

من یەکێك بووم لەو سێ نەخۆشەی که لە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی شاری (لەندەن) خەوێندرابووم، بە هۆی ڕووداوی هاتوچۆوە، لە نێوان (لەندەن)و (برایتۆن) تووشی بووم، دوای ئەوەی لە وڵاتی خۆم (ئیمارات) بە مەبەستی خوێندن نێردرابووم بۆ بەریتانیا، ئەوەبوو لە ژوورێکی سێ کەسی خەوێندرام که خۆمو دوو کوڕی بەریتانی لەو ژوورە بووین بە ناوەکانی ( دەیڤد)و (ئەلن) دوای یەك ڕۆژ لە مانەوەم لە نەخۆشخانە (ئەلن) دەرچوو لە نەخۆشخانە، منو (دەیڤد) ماینەوە، بە درێژایی مانەوەم لە نەخۆشخانە زۆر شەرمەزاربووم لە ئەنجامی ئەو بەراوردەی که لە نێوان حاڵی خۆمو (دەیڤد)م دەکرد، بەوەی بەردەوام زەنگی مۆبایلەکەم لێی دەدا کە هەمووی پرسیارکردن بوو لە حاڵم لە لایەن هاوڕێیانو برادەرانم، ئیتر حاڵم وای خواست کە زۆر بمێنمەوە لە نەخۆشخانە، هەربۆیە ڕۆژانە دەستە دەستە ئەو برادەرانەم کە لەگەڵم هاتبوون لە وڵاتی خۆم بۆ خوێندن، سەردانیان دەکردم بە مەبەستی ئاگاداربوون لە تەندروستیم، بەڵام یەك تاکە کەسیشم نەدی لەو شارە بێت سەردانی ( دەیڤد) بکات، ئیتر حاڵی منو دەیڤد بەو شێوەیە بەردەوام بوو، ڕۆژانە من بە کارتی هیوای تەندروستیو چەپکەگوڵو خەندەو چاکو چۆنی براو هاوڕێیان ڕۆژم بەڕێ دەکرد، ئەویش تاکو دەهات سەرسامی زیاتر دەبوو بەرامبەر ئەو حاڵەتەی کە منی تیادابووم، بەڵام ڕۆژێکیان سەرسامییەکەی لە ڕادەبەدەربوو، کاتێك بینی یەك لە هاوڕێیانم بە مەبەستی بازرگانی هاتبووە بەریتانیا، کە زانیبووی دووچاری ئەو ڕووداوە بووم، سەردانی کردم لە نەخۆشخانەو بە ئیدارەی نەخۆشخانەکەی وتبوو کە تەواوی خەرجی نەخۆشخانەی لەسەر حسابی ئەو بێت، پاشان پێش ئەوەی کە بڕوات مەبلەغێك پارەی خستە ژێر سەرینەکەم، زۆر پێداگریم کردو پێم گوت: پێویستم بەو پارەیە نییە، بەڵام پارەکەی هەر جێهێشت، بۆیە دوای ڕۆیشتنی ئەو (دەیڤد) زۆر بە سەرسامییەوە ڕووی پرسیاری لێم کردو وتی:

لەوە دەچێت تۆ پیاوێکی ناودارو بەناوبانگ بیت لە وڵاتەکەت؟

منیش زۆر بە هێمنی وەڵامم دایەوەو وتم: نەخێرنا من نە دەوڵەمەندێکی ئەوەندە گەورەمو نە پیاوێکی زۆر بە ناوبانگم لە وڵاتەکەم، بەڵکو هاوڵاتییەکی ئاساییم، بەڵام دەتوانم بزانم بۆچی ئەو پرسیارە دەکەیت؟

وتی: باوەڕناکەم، ئەی ئەو هەموو سەردانو کارت گوڵبارانکردنە چییە؟ لە لایەن هاوڕێکانتەوە کە بۆت دێن، زیاد لەوەش ئەو پیاوەی کە ئێستا لات بوو تەواو سەرسامی کردم؟!!!!!

منیش وتم: باوەڕ بکە من کەسێکی زۆر ئاساییم لە وڵاتی خۆم، بەڵام ئەوە (ئیسلام)ە کە دینی ئێمەیە ئەو ئەرکە پیرۆزەی پێسپاردووین، سەردانی نەخۆش بکەینو ئاگاداربین لە تەندروستیانو دەستی هاوکارییان بۆ درێژ بکەین.

پاشان وتی: من هەندێك کەسم دیت لەوانەی سەردانی تۆیان دەکرد خەڵکی وڵاتی تۆ نە بوونو هاوزمانت نەبوون ئەی ئەمەیان چی؟

منیش لە وەڵامدا پێم گوت: لە ئیسلامدا جیاوازی ڕەگەزو زمانو جوگرافیا بوونی نییە، چونکە خودا دەفەرمووێ باوەڕداران هەموویان براو خوشکی یەکترن بەبێ جیاوازی.

دوای ئەوە (دەیڤد) پێنج ڕۆژ پێش من لە نەخۆشخانە دەرچوو، پاشان کە من دەرچوومو گەڕامەوە شوێنی حەوانەوەم دوای ماوەیەك سەیرم کرد لە ناو پۆستەنامەکەمدا نامەیەکی (دەیڤد)ی تێدایە کە کردمەوە سەیرەکەم بە (السلام علیکم) دەستی پێکردووەو با سەرتان نەیەشێنم لە نامەکەیدا دەیڤد موسڵمان بوونی خۆی پێ ڕاگەیاندبووم. ناوی خۆی گۆڕی بوو بۆ (عومەر)و لە دوو توێی نامەکەیدا نووسیبووی من قەرزارم بە تۆ، بەو ڕۆژانەی کە لەگەڵ تۆ بە سەرم بردن لە نەخۆشخانە، هەرئەوەش پاڵنەرم بوو دوای دەرچوونم سووربم لەسەر خوێندنەوەی زیاتر لەسەر (ئیسلام).

ئیتر خوێنەری بەڕێز بەخوا کاتی ئەوە هاتووە بزانین ئێمە خاوەنی ئاینێکی چەند گەورەین خۆمان بناسین با تێڕامانێك بکەین لەسەر ئەو چیرۆکە بەوەی کە ئەو ئایینەی ئێمە ڕووکاروناوەڕۆکی کەمەندکێشی کەسانی ناموسڵمان دەکاتو دەبێتە جێگەی سەرسوڕمانی هەموو کەسانی ناموسڵمان بێ ئەوەی ئێمە قسەیەك لەسەر کارەکە بکەین، خۆیان پرسیارمان لێ دەکەن.

سەرچاوە: سایتی (صید الفوائد).

شێخانی

## پێش ماڵئاوایی

# ڕەمەزان پشوویەك بۆ ڕۆح

ڕەمەزان ئەو مانگەی تیایدا ڕۆح ئارام دەگرێتو لە چەند ڕۆژێکی ئەفسووناویدا دڵە سپییەکان دەگەنە ئۆخژنی خۆیان، لە ڕەمەزاندا مرۆڤ هەست دەکات کە ئەم تەنها پێکهاتەیەکی ماددی نییە، ڕۆح نهێنی ژیانو کلیلی بەختەوەریو مەڵبەندی شادمانیو لەزەتە حەقیقیەکانی مرۆڤە! ڕەمەزان مانگی خۆناسینو خواناسینو گەیشتنە بە پلەیەکی بەرز لە "خودکارگێڕی"دا، کە گرنگترین جۆرەکانی بەڕێوەبردنە.

ڕەمەزان وەرزی سەرکەوتنی گەورەیە بەسەر نەفسو ئارەزووەکاندا، ساتی بەهێزبوونی هەستی مرۆڤدۆستانەیە لە ناخی مرۆڤەکاندا، وەرزی خۆشەویستیو ئەوینو میهرو بەزەییو بەخشندەییە.

لەم وەرزەدا دڵەکان نورانی دەبنو دەگەشێنەوە، مرۆڤەکان لە جیهانێکی فریشتەئاسا نزیك دەبنەوەو هەوڵ دەدەن بەو نوورە دڵەکانیان وەکو بەفر سپی بکەنەوەو لە ژەنگی گوناهو تاوان قوتاربن.

لەم مانگەدا هەست بە برسێتی هەژاران دەکەین، هەست بە تینوێتی دڵەکان دەکەین بۆ دڵۆپێك میهرو خۆشەویستی، ئاوڕێك لە یەکدی دەدەینەوەو دوای زەمەنێك لێکدابڕان هۆگری یەکتر دەبینەوە.

ئەم وەرزە وەرزی گوڵبارانە، وەرزی بەهاری دڵانو ڕێژنەبارانی ڕەحمەتی کردگارە ساتو وەختی چاوەڕوانیکردنی میهری خودایيو پاکبوونەوەو لێخۆشبوونە، کاتی پێشبڕکێیە بەرەو لوتکەی بەرزیو بڵندی.

ڕەمەزان ژووانی ئاشتیخوازانی چاکویستو چاکخوازە، هەر بۆیە لە زووڕا دەستەو نەزەر ڕاوەستاونو وەکو میوانێکی ئازیز پێشوازی گەرمی لێ دەکەن. لەم مانگەدا برەو بە توانای ڕۆحی خۆیان دەدەنو دەزانن کە مرۆڤ تەنها لاشەیەك نییە لە گۆشت، ئاسوودەیی ڕۆح نهێنی بەختەوەری مرۆڤە، هەر بۆیە لەم مانگە پیرۆزەدا، فرمێسکی هەژاران دەسڕن، جارێکی تر خەندەیان دەخەنەوە سەرلێو، دەست بەسەر قژی ئاڵۆسکاوی بێباوکاندا دەهێننو لە ئامێزیان دەگرن. هیوا دەبەخشن بە مرۆڤە کەساسەکان، هەوڵ دەدەن زۆرترین گوڵ بڕوێنن، برینەکان سارێژ بکەن، دڵەکان ئاشت بکەنەوە، پەیامی پاکیزەییو عەفافو بەرزیو بڵندی بگەیەننە هەموو کونجێکی ئەم دونیایە.

لە پەروەردگار دەپاڕێنەوە، مرۆڤەکان هەموو ببن بە برا، دڕکەکان وشك بن، گوڵەکان چرۆی نوێ دەربکەنو بوونەوەر گوڵاوپڕژێن کەن. هیوادارن ڕووپۆشی ڕەشی خەم لەسەر سیمای هەموو جیهان لابرێو خەندەو پێکەنین هەموو دونیا داپۆشێت.

*ڕەمەزان بۆ ئەوان هێلانەیەکە ڕۆحیان تێیدا ئارام دەگرێتو تیایدا هەست بەوپەڕی ئاسوودەیی دەکەن.*